# سوڵتانی عارفان

## (بایەزیدی بەستامیی)

**عەلی نانەوازادە**

ستۆکهۆڵم - ٢٠٠٩

MUKIRYANI

ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION

**هەولێر - ٢٠١١**


دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **سوڵتانی عارفان (بایەزیدی بەستامیی)**
- دانەر: عەلی نانەوازادە
- نەخشەسازی ناوەوە: رێدار جەعفەر
- بەرگ: حەمیدە یوسفی
- ژمارەی سپاردن: (٦٦٤) لە ساڵی ٢٠١١
- نرخ: (٣٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم: ٢٠١١
- تیراژ(٥٠٠) دانە
- چاپ: چاپخانەی رۆژهەڵات (هەولێر)

زنجیرەی کتێب (٥٨٤)





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

" به پێی نەقڵ و ڕەوایات و ئەخبار کە دە کتێبەکان دا هاتووە دەبێ ئینساف بدەین کە هیچ دین و ئایینێک چی لەویدیکە کەمتر نییە. کەوایە هەرکام بە هەقانییەت هەڵبژێری زوڵم لەوانی دیکە دەکەی!

لێیدەپرسن: بۆ لە سەر ئەو دینەی کە هەی، ماوی؟

کوتی: چونکە حورمەتێکی تایبەتیی هەیە. من بەمە لە دایک بووم و دەگەڵ ئەهلی ئەم دینە دەژیم. وێنەکەی وەها دەبێ کە لە ڕۆژێکی بارانە دەچیە کاروانسەرایەک و خاوەن کاروانسەرا بێ ئیختیار و ڕای تۆ دەتباتە ژوورێک. حەوش پڕە لە قوڕ و چڵپاو. ئەگەر بتەوێ ژوورەکەت بگۆڕی و بچیە دیوێکی دیکە حەسانەوەت تێکدەچێ و پێت قوڕاویی دەبێ. لە سەر جێی خۆت دەمێنییەوە. ئەوە مانای ئەوە نییە کە ئەم ژوورەی تۆ تاقە سەرپەنایە یا لە هەموان باشترە.

من لە دایک بووم و دە هەلومەرجێک دا کە چووک بووم و زانیارییەکم نەبوو دایک و باوکم منیان هێنا نێو ئەم دینە. لە دواییش کە لێکمداوە خەڵکی دیکەش هەر دەو وەزعە دان. دیتم کە ئەگەر هەر لە سەر ئەم ئایینە بمێنمەوە حورمەتم پترە و مامەوە. هۆیەکی دیکەی نییە و من حوجەتێکم نییە کە ئەوانی دیکە نەیانبێ. "

**ابوحیان توحیدی**

**(٩٢٠.ز /١٠١٠.ز)**

زۆربەی ئەو عارفانەی کە ناوبانگیان هەیە و قسەکانیان پشتاوپشت و سەدە بە سەدە گەیشتۆتە ئێمە خۆیان هیچیان نەنووسیوە و تەنانەت دە هەندێک ڕەوایەت دا ئەو کتێبانەش کە نووسیویانە، سووتاندوویانە یا لە بن عەرز چاڵیان کردووە.

ئەبووسەعیدی ئەبولخەیر وەختایەک لە عیلمی قال ڕووی دە عیلمی حال کرد و لەزەتەکەی چێژت، هەرچی کە لە کتێبان خوێندبوویەوە و نووسراوەی کۆ کردبۆوە یا نووسیبووی، هەمووی چاڵ کردن و نەمامێکی لە سەر چەقاند کە بوو بە درەختێکی گەورە.

ئەوەی کە لەو عارفانە بە جێماوە چەند ڕەوایەت و قسەی پەرژ و بڵاون کە تەنانەت مەرجەعیەتی قسەکانیشیان جێگەی شکە کە هی کەسانی دیکە بووە یا نا و ئەوان خۆشیان ئەو گرینگایەتییەیان پێنەداوە و خەمی قسەوباس و بۆچوونی خەڵکیان نەخواردووە. ئەوەی کە بۆیان گرینگ بووە و مەبەستیان بووە شۆک و نەقورچ و تەکانێک بووە بۆ چاو کردنەوە و بێدار بوون. دوکتور و تەبیبێک بوون کە هەوڵیان داوە بێهۆش، بە زللە و لەپاتەیەک وە ئاگا بێنن. کە وە هۆشیش هاتەوە خۆی دەزانێ کە چ قەوماوە.

مرۆڤ هەتا گەیشتن بە مەعرەفەت و خۆناسین دەبێ لە سێ قۆناغ تێپەڕێ.

**یەکەم:** قۆناغی دانیی یا هێلکەیی یا کرمیی (شەریعەت)

**دووهەم:** قۆناغی ڕسکان یا چووجکەیی یا پیلەیی (تەریقەت)

**سێهەم:** قۆناغی درەختیی یا مەلیی یا پەپوولەیی (هەقیقەت).

ناوکی چەقالەیەک کە هەڵگری درەختێکی گەورەی بە لک و پۆ و بەرداره بە توێکڵێکی ڕەق پارێزراوە؛ هێلکەیەک کە هەڵگری مەلێکە کە ڕۆژێک دەتوانێ لە ئاسمان باڵ بوەشێنێ بە توێکڵێک دەورەی گیراوە. قۆناغی یەکەم قۆناغی پەروەران و پێگەیشتن و ئامادە بوونە. هەر دەنک



و هێلکەیەک لەم قۆناغە بوەستێ دەڕزێ و بۆگەن دەبێ و دە زیندانی خۆی دا زیندەبەگۆڕ دەبێ. فەرهەنگ و قانوون و مەزهەب و هەر شتێکی لەو بابەتە کە کەس یا کۆمەڵگا دەپارێزێ، شەریعەتە. شەریعەت تەمرین و ئینزبات و مراقبەیەکە بۆ خۆ گرتن. مەبەست لە نوێژ و ڕۆژوو و دوعا و کۆمەڵێک ئەحکام و فەرز، ناسیاویی دەگەڵ عالەمێکی دەروونی و سەرووترە هەتا مرۆڤ ڕابێ و پێبگا و سانا بتوانێ توێکڵی ڕەقی دەواندەوری خۆی بشکێنێ و خۆ بگەیەنێتە قۆناغی ڕسکان و جووجکەیی.

مەزهەب و بیر و باوەڕ دەبێ وەک فێرگەیەکی سەرەتایی بن کە منداڵ فێرە ئەلفوبێ و خوێندنەوە و نووسین بکەن. هەتا بزانن کە دەتوانن کتێبی ژیان بخوێننەوە، دەتوانن لە دونیای ڕەنگینی کەسانێکی وەئاگاهاتوو میوان بن. دەتوانن لە ئەزموونی ڕێبوارانێک لەو ڕێگا خوار و خێچانە ئاگادار بن و هەنگاوەکانیان قایمتر هەڵگرن و پێیەکانیان بە دڵنیاییەوە لە سەر پلەکانی پەیژەی سەرکەوتن دابگرن. کەچی مامۆستایانی فێرگەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە هەوڵی ڕاگرتنی فێرخوازان دەو قۆناغە دان و خودی فێرخوازانیش فێر دەبن کە پتر لەوەیان نەوێ و " من دەمەوێ " فەرامۆش بکەن و ملکەچ و گوێڕایەڵی " تۆ دەبێ " بن. مەلاکان و قەشەکان و سەرۆک حیزبەکان وەها نوقمی شەریعەت و دووپاتە کردنەوەی وانە سەرەتاییەکانن کە هەنگاو و هەوڵی کەسانی دیکە بۆ شکاندنی توێکڵ و تێپەڕین لەو قۆناغە بە لادان و تاوان و خیانەت و بیدعەت دادەنێن و کۆمەڵێک سزا و ئیعدام و مەرگیان بۆ هەڵدەبژێرین.

بە هەر حاڵ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی زۆرینەیان شەریعەتخوازانن و هەمیشە ئەوان بوون کە دەستەڵاتیان بە دەستەوە گرتووە و بە چەک و سپا ئەو دەستەڵاتەیان پاراستووە و بەرگرێک بوون بۆ گەیشتن بە قۆناغی دووهەم.

قۆناغی دووهەم کەمایەتییەک لە خەڵکن کە توێکڵی ڕەقی ڕواڵەتی دان یا هێلکەیان شکاندووە و لە تاریکایی دالآنە پێچاوپێچەکانی ژێرزەوی تێپەڕیون و پێیان ناوەتە سەر ڕووی زەوی و هەتاویان بینیوە. جووجکەیەکن لە سەر هێلانە کە هێشتا وابەستەی دایک و باوکن، مریدانێکن چاو لە دەستی ڕێبەران و پێشڕەوان و ڕێپێشاندەران. هێشتا ماویانە هەتا پەڕ دەربێنن و باڵ بە هێز بکەن. تەریقەت قووڵاییەکە بۆ سەراییەکان، دەروون و مانایەکە بۆ ڕواڵەت، ژوور و ماڵێکە لە پشت دیوارەکانی شەریعەت. فێرگەیەکە بۆ ناسیاویی دەگەڵ دوانەیی و دژەکان. کە ئەگەر شەو و تاریکی هەیە، ڕۆژ و ڕووناکیش هەیە، کە شەو و ڕۆژ هەرچەند دژ دەنوێنن بەڵام دە ڕاستی دا هاوتای یەک و تەواوکەری یەکترن. کە دۆزەخ و بەهەشت دە دەروونی یەک کەس دا هەڵکەوتوون، کە ئەگەر دیوارت جێ هێشت و گەیشتیە ژوورەکان، نها دەبێ قۆڵ هەڵماڵی و ئەو ژوورانە خاوێن بکەیەوە و بیانڕازێنییەوە.

ئەم قۆناغەش بە داخەوە دوکان و دەم و دەزگای خۆی هەیە و تاقمێک بە ناوی شێخ و ئەربابانی تەریقەت، دەروێش و مریدی گوێڕایەڵ لە خۆیان کۆ دەکەنەوە و دونیای دەروون و هەوڵی خۆناسین، بە دونیای سێحر و ئەفسوونبازیی و جەزم بوون و زەرگ لە خۆ کوتان و شووشە جاوین و مورتازگەریی لێکدەدەنەوە.

قۆناغی سێهەم هەقیقەتە. قۆناغی بێداریی، قۆناغی پەپوولەیی، قۆناغی گوڵ دان و بەر دان، قۆناغی ئەزموونی خەست و خالیسی فڕینە. ئەو کەسانەی کە بە سەر هێزی ڕاکێشەری سەختی بیر و باوەڕەکان دا زاڵ بوون و خۆ لە پەت و بەند و چەسپی دوانەیی و چەندیی ڕزگار کردووە و پێیان دە هەرێم و هەوای یەکیی و وەحدانیەت ناوە و بوون بە عارف. شیبلی دەڵێ " شەریعەت ئەوەیە کە: ئەو بپەرستی و تەریقەت ئەوەیە کە: ئەو بخوازی و هەقیقەت ئەوەیە کە: ئەو ببینی. " و بڵێی: ئەی من.



عارفەکان دوو دەستەن.

دەستەیەک کە کاتێک بە ئیشراق و مەعرەفەت دەگەن بێدەنگ دەبن. دەستەیەکیش کە بە پێچەوانە وە زمان دەکەون. دوو حەدیس لە مەحەممەد هەیە کە لە دوو حاڵی جیاوازدەدوێ و دەڵێ: ئەو کەسەی کە خودای ناسی زمانی دەبەستریێ و لاڵ دەبێ. هەروەتر دەڵێ: ئەو کەسەی کە خودای ناسی زمانی دەکرێتەوە. لەوانەیە ئیشارە بەو مەبەستە بێ.

ئەبووسەعیدی ئەبولخەیر دەڵێ: هەقیقەت حەیرەت و سەرسوڕمانە. بوودا وەختایەک بە ئاگایی گەیشت و بێدار بوو بە ئەزموونێک گەیشت کە خۆی سەری سوڕما. مەلێک کە لە سەر هێلانەوە خۆی بە ئاسمان دابدا و ئەزموونی فڕین بکەوێتە بن باڵەکانی واقی وڕدەمینێ کە ئاخۆ ئەو ئەزموونە چلۆن باس بکا. ئەزموونێک کە شتێکی شیاوی پێدان نییە و هەرکەس دەبێ خۆی ئەزموونی بکا. بوودا تێگەیشت کە ناتوانێ ئەو ئەزموون و ئەو دونیایە بە کەس بدا و بە تەما بوو کە خامۆشیی هەڵبژێرێ. دانی نیلووفەرێک کە لە بنی لیتە و ڕەشاو سەری دەرکێشاوە و ئێستاکە گەرمای گزینگی هەتاو دەچێژێ و ئاونگی بەرەبەیانی ڕوخساری ڕادەمووسێ چلۆن دەتوانێ ئەزموون و چێژ و گەرمای هەتاو بۆ ئەو دەنکە سڕ و لەرزۆکانی ژێر مرداو بەرێتەوە کە: مەوەستن و هەوڵ بدەن لەو سەرانە خەبەرگەلێکی دیکە هەیە! و هەر ئەوەش بوودای هان دا کە زمان بکاتەوە و خەبەر بدا. خەبەر بەو نیلووفەرانەی کە بەڕێوەن و لە داهاتوویەک دا لەوانەیە سەر بکەون و سەر دەربکێشن.

ئەو عارفانەی کە لاڵ و خامۆش دەبن، لایانوایە کە ئەو ئەزموونە شیاوی باس کردن نییە و هەرکەس دەبێ ڕووداوەکەی دە دەروونی

خۆی دا کەشف بکا. هەر جووجکەیەک دەبێ بۆ خۆی خۆ بە هەوا دابدا. ئەوەیەکە ئەو دونیایە بۆ خۆیان ڕادەگرن و بە بێدەنگیی لە ئاسمانی خۆیان دەفڕن و دە نێو کۆمەڵگا دا وەک کەسانی سادە، کار دەکەن و زەحمەت دەکێشن و باری خەڵک دەکێشن و ئارام ماڵاوایی دەکەن و دەڕۆن.

بەڵام ئەو عارفانەی کە زمان دەکەنەوە، ڕێپێشاندەرانن - کە ئەوانیش دوو دەستەن. - دەستەیەک دەگەڕێنەوە بن زەلکاو و ئەو دەنکانە خەبەردار دەکەنەوە. ئەو کەسانە دەگەڕێنەوە نێو ئەشکەوتە نیوەتاریکەکانی ئەفلاتوونیی و هەوڵ دەدەن زنجیر و بەندی دەست و پێی ئەو خەڵکە کە دونیاکەیان سێبەری ڕەشی سەر دیوارە، بەرەو دونیای هەقیقەت و ڕەنگاوڕەنگ ببەن. ئەوان دەزانن دە نێو ئەو کۆمەڵە سۆفی و زاهید و عابید و عالیمە دا کەس و کەسانێک هەن کە ئیمکانی فڕین و ئازاد بوون دە خۆیان دا هەست پێدەکەن و لە دەستی درێژکراوەی ڕێبەران و پێشەوایانێک دەگەڕێن کە بەرەو ڕێگای فڕین و ئازاد بوون یارمەتیان بدا. ئەو پێشەوایانە دەزانن داستانی فڕین و باوەڕاندن هەم زەحمەتە و هەم باسی سەر و جەماعەتی شەریعەتخواز بێدەنگ و ئارام دانەنیشتوون. حەللاجێک کە بۆ خاتری دەربڕینی گۆشەیەک لەو ڕازە لەت و پەت کرا و بە دڕندانەترین شێوە لە دار درا؛ سوقراتێکی حەفتاساڵە شۆکەرانی دەرخوارد درا؛ عیسایەکی سی و سێ ساڵە لە سەر خاچ بزمارکوت کرا؛ نەسیمییەک کە کەوڵیان کرد و کایان دە پێستی ئاخنی؛ بوودایەک کە چەند جار تێرۆریان کرد و شانسی خۆی وەبەر نەهات، ئەبووعەتایەک کە بە لینگەکەوش هێندەیان لە سەری کوتا هەتا مرد؛  بایەزیدێک کە ئینکاریان کرد، تەمای کوشتنیان گرت و حەوت جار لە شار و زێدی



خۆی دەریان کرد؛ کە دیارە دەرکردنیش بە حورمەت و ڕێزەوە نەبووە و سەدان شەق و خڕکە بەردی وێکەوتووە کە دە کتێبەکان دا باسی نەهاتووە. ئەو دەستەیە کەسانێکن کە باوەش بۆ مەرگ دەکەنەوە و ئەو ڕازە دەردەبڕن کە شەریعەت و تەریقەت قۆناغگەلێکن بۆ تێپەڕین، نەک وەستان. دان کە ئەگەر سەری دەرکێشا ئیدی پێویستی بەو توێکڵە ڕەقە نییە. مەحەممەدیی ئەوەیە کە ئەگەر مەحەممەد عرووجی کرد تۆش عرووج بکەی، لۆتکەیەکە بۆ پەڕینەوە لە ڕووبار و کە پەڕینەوە ئیدی بە کۆڵ دادانی لۆتکە پێویست ناکا، تەعلیماتێکن بۆ فێر بوون نەک بۆ باوەڕ و ئیمان پێهێنان. نوێژ و ڕۆژوو تەمرینێکە بۆ چوونە نێو دونیای دەروونەوە نەک واجبێکی ئەبەدیی. ئەوان ڕووڕاستن دەگەڵ خەڵک و دەگەڵ بەرەکانی داهاتوو و گیان بۆ ئەو هەقیقەتەیان بەخت دەکەن.

دەستەیەکیش هەن دە نێو ئەو عارفانە دا، مامۆستان. ئەوان لایانوایە کە منداڵ دەبێ لە ئەلفوبێوە دەست پێبکا و بەرەبەرە هەتا هەڵدەکشێتە قۆناغەکانی سەروو. ئەو مامۆستایانە دژایەتی شەریعەت ناکەن و وەک مەولەوی توێکڵی ڕەق بۆ پاراستن و هەتا سەر دەرکێشان بە پیویست دادەنێن و هەوڵ دەدەن لانیکەم جووجکە سەر لە هێلکە دەرکێشێ کە چون جوجکە ئیمکانی فڕینی پترە هەتا هێلکە؛ هەرچەند ئەوەش ناشارنەوە کە کوللیەتێک هەیە وەک دەریا و ئێمە هەموومان دڵۆپگەلێکین لەوەوە هاتووین و بە ڕێگاگەلی جۆراوجۆر دا بەرەو ئەو بەڕێوەین و دەتوانین بگەینە پلەی فەنا بوون دە دەریا دا و هاواری من دەریام  و هاواری ئەنەلهەق بەرز بکەینەوە.

خەڵک چوار دەستەن:

یەکەم ئەوانەی کە نە زمانیان هەیە و نە دڵ. ئەوان خەڵکی ئاسایین و هەقیقەتیان بۆ گرینگ نییە.

دەستەی دووهەم زمانیان هەیە و دڵ نا؛ ئەوان زانست و زانیاریی زۆریان هەیە و خەڵک ڕێنوێنی دەکەن بەڵام خۆیان دە ژیان دا لەزەتخواز و یاغیین.

دەستەی سێهەم ئەوانەن کە دڵیان هەیە بەڵام زمان نا؛ ئەوان ئیمانداران و ڕاستییخوازانن و هەمیشە خەریکی ڕازاندنەوەی دەروونن. بۆ ئەوان خامۆشیی و خەلوەت زۆر باشە.

دەستەی چوارەم هەم دڵیان هەیە و هەم زمان. ئەوان خاوەنی هەقیقیی مەعرەفەتن.

**غەوسی گەیلانی**



دە ئەدەبیاتی تەسەووف دا و لای زۆر کەسان سۆفی و عارف پتر بۆ یەک مانا بە کار دەبردرێن و عیرفان و تەسەووف بە یەک دادەنێن و هەندێک هەن کە لێکیان جوێ دەکەنەوە یا بە وشەگەلی دیکەی وەک زاهید و عابید و سۆفی و ئازادە ئەو جیاوازییە دەردەبڕن.

من سۆفی بە جوجکەی قۆناغی دووهەم دادەنێم، مەلێک کە هێشتا پەڕەوازە نەبووە یا لە باشترین حاڵەتی دا مەلێک کە پەت و بەند و بەرگرێکی هەڵفڕینی پێوەیە، بە ئاوێک کە لە سەر ئاگر گەرم داهاتووە و لەوانە جیزەجیزیش بکا بەڵام عارف بە ئاوێک دادەنێم کە دەکوڵێ و گەیشتۆتە سەد، بە مەلێک کە خۆی لە هێلانە فڕێ داوە و هیچ پێوەلکاوییەکی نییە و لە ئاسمان دەفڕێ و لە هەموو شەریعەت و تەریقەت و مەزهەب و بیر و باوەڕێک ئازادە. بە قەولی مەولەوی:

**ئازادەیەکم دیت لە سەر ڕووی زەمین**
**نە کفر و نە ئیسلام و نە دونیا و نە دین**
**نە هەق، نە هەقیقەت، نە شەریعەت، نە یەقین**
**کێ زاتی ئەوەی هەیە بڵێ کە: ئێمەین هەوین**

**یا**

**لە کفر و ئیسلام بەدەر هەیە سارایەک**
**لەم نێوە هەمە ئەمن سەودایەک**
**عارف کە بگاتە ئەم پلە سەر دانێ**
**نە کفر و نە ئیسلامە، نە جێگە و جایەک**

عیرفان تەجرووبەیەکی دەروونیی فەردییە. هیچ مەلێک ناتوانێ لەجیات مەلێکی دیکە بفڕێ. هیچ کەسێک ناتوانێ لە جیات برسییەک نان بخوا. گرینگ نییە مرۆڤ دە ژیانی دا چ بیر و باوەڕێک پەیدا دەکا و پێ دە کام فێرگە دەنێ. گرینگ ئەوەیە کە ئەو باوەڕە وەک ئامێر و کەرەسەیەک چاوی لێبکا. وەک پلەی پەیژەیەک، وەک مەشعەلێک بۆ نێو تاریکایی ئەشکەوتەکان، وەک ژێیەک بۆ دەرپەڕین لە کەوان، وەک لۆتکەیەک بۆ پەڕینەوە لە ڕووبار. بوودا دەڵێ " وانە و تەعلیمەکانی من کەڵەکێکن بۆ پەڕینەوەی کەس و کەسانێک لە ڕووبارێکی بە سام و خوڕێن. کە گەیشتە بەستێنی ئەو بەری ڕووبار، کەڵەک لە خۆتان مەکەنە بار " کە لە تاریکایی هاتنە دەر ئیدی مەشعەل بە کارتان نایە، کە لە کەوان دەرپەڕین ئیدی کەوان دەگەڵ خۆتان مەکێشن، کە گەیشتنە سەربان پێویست ناکا پەیژەش دەگەڵ خۆتان هەڵبکێشن. بڵا ئیسلام و بوودیست و کۆمۆنیست و ناسیۆنالیست و هەموو ئیست و باوەڕ و بیرێکی دیکە پلەی پەیژەیەک بن بۆ پێ لە سەر دانان و بۆ لێتێپەڕین. کەسێک کە بەرەو سەر و سەرتر دەڕوا، کەسێک کە دەیەوێ لە کێوێکی بەرز سەربکەوێ بڵا با لە ترسی کەوتن و داکەوتن خۆی بە شەریعەت و پەت و بەندەکان ببەستێتەوە. بەڵام کە گەیشتە لووتکە و باڵی لێڕوا ئیدی ڕەوا نییە کۆڵەبارەکەی تووڕ هەڵنەدا و هەوداکانی وردی تەریقەتیش تەنانەت لە خۆی نەکاتەوە و خۆ بە باوەشی ئاسمانی هەراو دا نەدا و ئازاد و سەربەست بۆ دوور باڵ نەوەشێنێ و سەیری دونیا نەکا.

بایەزید دەڵێ " عارف باڵندەیە و زاهید ڕەوەندە "



**خەڵیفە لە شێخ ئەبولحەسەنی حوسریی پرسی " چ مەزهەبێکت هەیە؟"**

**کوتی " مەزهەبی بووحەنیفەم هەبوو، چوومە سەر مەزهەبی شافیعی و ئێستا خەریکی شتێکم کە لە هیچ مەزهەبێک خەبەرم نییە."**

**کوتی " ئەوە چیە؟ "**

**کوتی " سۆفیایەتی. "**

# پێشەکی

هیچ بابەتێکی ئەهلی تەسەووف نییە کە گۆشەیەکی بە قسەکانی بایەزید نەڕازابێتەوە. بە خوێندنەوەی هەندێک لە قسەکان و ڕەوایەتەکانی بایەزید و هەڵسەنگاندنیان دەگەڵ عارفان و سۆفییانی هاوچەرخ و تەنانەت چەند سەدەی دوایەش زۆر سانا چێژ و تایبەتمەندیی دەموڕاوێژی بایەزید دەردەکەوێ. نازناوی سوڵتانەلعارەفین بە هەق کە شیاوی ئەو نازەنین عارفەیە کە گڕی مەعرەفەتی شەمی تەمەنی خۆی پێشکەشی کۆڕی مرۆڤایەتیی کرد و لە دەریای بێبنی ئەشق بە کۆش و باوەش مرواری و دوڕی دەرکێشا و لە سەر داوێنی مێژووی هەڵڕشت و دەست بە دەست گەیشتۆتە ئێمە.

دە زۆربەی کتێبەکان دا هاتووە کە بایەزید (ئەبوویەزید تەیفوور) لە ساڵی ١٦١ی کۆچی مانگیی/ ٧٧٨ زایینیی [لە گەڕەکی مۆبیدان] لە دایک بووە و بەشی زۆری تەمەنی خۆی لە شاری بەستام گوزەراندووە؛ حەفتا و سێ ساڵ ژیاوە و لە ساڵی ٢٣٤ی کۆچی مانگیی وەفاتی کردووە. بایەزید کوڕی عیسایە و عیسا کوڕی سرووشان کە کابرایەکی گاور بووە.

" هۆی ئیسلام هێنانی سرووشان ئەوە بوو کە ئەو دۆستایەتی هەبوو دەگەڵ کوڕی کابرایەک بە ناوی ئیبراهیم کە لە سەرەتای ئیسلامەوە هاتبوو بەستام. ئیبراهیم لۆمەی کوڕەکەی کرد کە بریا



تێکەڵاویی دەگەڵ تیرەی عەرەبەکان هەبا کە بۆی باشترە و ئەو کابرایەکی گاورە. کوڕ کوتی: بابە ئەو پیاوێکی چاک و دڵفرەوان و بە وەفایە بۆیە تێکەڵاوییم دەگەڵ هەیە. باوک پێیکوت کەوایە پێیبڵێ کە باوکم دێتە میوانیی تۆ. کوڕ خەبەری دا و ئەو کوتی: باشە، ئەگەر بێ لە سەر منە کە ڕێزی بگرم و دیاریی بدەمێ. کە حازر بوو، سرووشان تەعامی هێنا. ئەو کوتی: من لەو تەعامە ناخۆم هەتا حاجەتی من پێکنەهێنی. پرسی کە: حاجەتی تۆ چیە؟ کوتی: ئەمە کە ئیسلام بێنی. ئەو کوتی : وا دەکەم هەڵبەتە.

ئەمە بوو هووی ئیسلام هێنانی. " (دەفتەری ڕۆشنایی ل ١٠٩)

ڕوون نییە کە ئەو داستانە چەندە ڕاستە و هەرچێک هەیە دڵفرەوانی و دڵاوایی سرووشان دەگەیەنێ کە باوەڕ وەک کراسێک بۆ خاتری سوننەتی ڕێز و حورمەتی میوان لە بەر خۆی دادەکەنێ کە هەر ئەو کارە لە لایەن باوەڕی ئیبراهیمەوە سزای مەرگی هەیە.

لە سەر ژیانی شەخسی بایەزید ئەوەندەی کە لە قەولەکان و ڕەوایەتەکان دەردەکەوێ، عیسا باوکی بایەزید یەک لە گەورەکانی بەستام بووە و بایەزید هێشتا منداڵ بووە کە مردووە. ئەوان سێ برا بوون و دوو خوشک. بایەزید برای نێونجی و ئادەم براگەورە بووە. ئادەم کوڕێکی هەبووە بە ناوی ئەبوومووسا کە خزمەتی بایەزیدی کردووە و یەکتریان زۆر خۆش ویستووە و ئەبوومووسا خزمەتی بایەزیدی لە هەموو خزمەتێک پێ گرینگتر بووە و سەبارەت بە حورمەتی پیر و ئوستاد دەڵێ " ئەگەر خودای تەعالا بە بەندەکەی شتێک ڕووناکتر لەو هەتاوە بنوێنێ و ئوستاد ئەوی بە شوێن کارێک لە کارەکانی دونیا دا ناردبێ و ئەو کارەکە بەربدا ئایا پێتانوایە ئەوە حورمەت ڕاگرتنە؟ " بایەزیدیش دڵی چاک بە دڵی ئەبوومووسا

دەشوبهێنێ. - ئەو دڵی دڵێنە، نەک دڵی گڵێنە. -ئەبووموووسا دەڵێ "چوارسەد قسەم لە قسەکانی بایەزید دەگەڵ خۆم بردە نێو گۆڕەوە چون کەسێکم نەدیتەوە کە بۆ بیستنی ئەهل بێ. " و ئەبووموووسا بە گۆڕهەڵکەنی خۆی کوتبوو کە " گۆڕی ئەبووموووسا خوارتر لە گۆڕی بایەزید هەڵکەنە هەتا لەحەدی ئەو بەرابەر لەحەدی بایەزید نەبێ، لەبەر حورمەتی شێخ. "

بایەزید ژنی نەهێناوە و بە سەڵتی ژیاوە. هەرچەند ئیشارەیەک هەیە کە بایەزید ئوممی بووە بەڵام واوێدەچێ کە سەوادی هەبووە و لە ئیسلام و شەریعەت و قورئان قووڵ بۆتەوە و سەرای ئەوەش ناسیاوی دەگەڵ کۆنە دینی بنەماڵەی خۆی، دینی زەردەشت هەبووە و تەنانەت چەند دراوسێشی زەردەشتیی بوون و یەک لە مامۆستاکانی تەریقەتیشی ئەبووعەلی سەندیی، هیندوویەک بووە کە تازە ئیسلامی هێناوە و بێشک ئاشنایەتی دەگەڵ دینی هیندوو و ئوپانیشناد هەبووە " من لە ئەبووعەلی عیلمی فەنا فی تەوحید فێر دەبووم و ئەبووعەلی لە من الحمد و قل هو الله. " (شرح شطحیات ل ٣٥) یا دە کتێبی اللمع فی التصوف دا هاتووە کە: " بایەزیدی بەستامی کوتی: دەگەڵ ئەبووعەلی سەندیی هاوڕێ بووم. من ئەوم فێرە واجباتی ڕێگە دەکرد و ئەو تەوحید و هەقایقی فێر دەکردم. " (ل ٢١٥) هەموو ئەوانە بوونە هۆی ئەوە کە بایەزید ڕوانگەیەکی بەرفرەوان و قووڵ بۆ خۆی پێکبێنێ و تەنانەت لە سەر مەسلەکانی شەریعەتیش بە قووڵیی بدوێ. عیرفان ڕوانگەیەکی ئازاد و سەربەستە و ئەگەر ڕێگاکان بۆ گەیشتن بەو ڕوانگەیە جیاواز بن بەڵام نەهایەت هەموو ئەو ڕێگا و ڕووبارانە دەگەنە یەک لووتکە یا یەک دەریا و کۆمەڵی عارفانی هەموو تەریقەتەکان وەک یەک



دەچن و دەکرێ باس و نەقڵەکان و قسەکانی بوودا و لائۆ زە و چوانگ زە و دیۆژێن و سوقرات و شیبلی و بایەزید وەک یەک بچن و لێک نزیک بن.

ئەو کتێبە میکس و مونتاژێکە لەو کتێبانەی کە پێوەندییان بە بایەزیدەوە هەیە و دەو نێوە دا باسی بایەزید لە کتێبی تەزکەرەی ئەولیا وەک بنەما هەڵبژێردراوە و لە ماباقی کتێبەکان بۆ کامیل کردن و هەڵسەنگان کەلک وەرگیراوە. یانی لەو شوێنانەی کە مەرجەع دەست نیشان نەکراوە ئەو باسە هی تەزکەرەی ئەولیایە و ماباقی ناوی کتێبەکان و ژمارەی لاپەڕەکان هاتوون.

یەک لەو کتێبانەی کە فەریددەینی عەتتار بۆ بەشی بایەزید دە کتێبی تەزکەرەی ئەولیا دا کەلکی لێوەرگرتووە کتێبی النور-ی سەهلەگی – یە کە لە سەدەی پێنجەم نووسراوە و شفیعی کدکنی کردوویەتی بە فارسی و ناوی ناوە دفتر روشنایی (دەفتەری ڕۆشنایی) کە بۆ ئەم کارە زۆری ئیشارە پێکراوە.

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا هاتووە:

" ناوی تەیفوور دە قەبیلە و قەومی وی دا زۆرن، چ دە سەردەمی وی دا و چ دە غەیری ڕۆژگاری وی دا... بەڵام ئەمە ئەوە کە تەیفوورە، نوور لە سەر نوورە و یادی لە سەر ڕوخساری ڕۆژگاران جاویدان... دڵێکی شەیدای هەبوو و لە لۆمەی لۆمەکەران بێباک. شتگەلێکی دەزانی کە وشیاران لێی بێخەبەر... فامی خەڵک لە مەعرەفەتی کەلامی وی داماو و ئەوهامی خاس و عام لە مەعانیی لەفزی وی حەیران. لەفزەکانی ویان ڕەوایەت دەکرد و لە غەرەزی وی نەدەگەیشتن، شتە سەیرەکانیان دەگێڕاوە و عەجایبی کاری ویان نەدەناسی، وردەکارییەکانی ویان کۆ دەکردەوە و هەقایقی

ویان نەدەبیست، عیبارەتی ویان ڕادەگەیاند و لە ئیشارەتی نەدەگەیشتن. دە ڕێگەی خودا دا هەنگاوی قایم بوو و گەلێکی خزمەت کرد وەها کە لە هەموان وە پێش کەوت و هەرگیز پەشیمان نەبۆوە. "

١.

**ئەبوویەزیدی بەستامیی** گەورەی مەشایخ، مەزنی ئەولیا، حوججەتی خودا، خەلیفەی بە هەق، قوتبی عالەم و مەرجەعی ئەوتاد بوو. ڕیازات و کەراماتی ئەو گەلێکن. لە ئەسرار و هەقایق نەزەرێکی تیژ و جیددی هەبوو. دایم لە پلەی قورب و هەیبەت دابوو و نوقمی ئاگری مەحەببەت. هەمیشە لەشی تووشی موجاهیدە و دڵی خەریکی موشاهیدە دەکرد- ڕەوایەتی ئەو لە سەر حەدیسەکان عالی بوو و بەر لەو کەس دە مانای تەریقەت دا ئەوەندە ئیستنباتی نەبوو کە ئەو هەیبوو. دەکرێ بڵێین کە: دەو ڕێبازە دا هەر ئەو بوو کە ئاڵای خۆی لە سەحرا داکوتابوو و کەماڵی ئەو شاراوە نییە وەها کە **جونەید** کوتی " **بایەزید** دە نێو ئێمەمانان دا وەک **جبرەییل**-ە دە نێو مەلایکە دا " هەر دیسان ئەو کوتوویەتی " نەهایەتی مەیدانی ڕێبوارانی بەرەو تەوحید، بەدایەتی مەیدانی **بایەزیدە** تەواوی ئەوانەی کە بگەنە بەدایەتی هەنگاوی ئەو، هەموو نوقم دەبن و دەفەوتێن." و دەلیل لە سەر ئەو قسەیە ئەوەیە کە **بایەزید** کوتی " دەبێ دووسەد ساڵ بە سەر گوڵشەنێک دا تێپەڕێ هەتا گوڵێکی وەک ئێمە بپشکوێ. "

**شێخ ابوو سعید بن ابی الخیر** کوتی کە " هەژدە هەزار عالەم لە **بایەزید** پڕ دەبینم و **بایەزید** دە میان دا نییە " — یانی ئەوەکە **بایەزید،** دە هەق دا مەحوە.

--------------------

هەروەتر دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا هاتووە کە:

شێخ ئەبووعەلی روودبارییی دەڵێ کە " بایەزید دە نێو قەوم دا وەک هەتاوێکە بە سەر هەموو عالەم دا دەدرەوشێتەوە. " (ل ٣٤٠)



٢.

جەددی ئەو گاور بوو. یەک لە گەورەکانی **بەستام** باوکی وی بوو. ڕووداوی ئەو هەر دە زگی دایکی دا دەستی پێکردووە وەها کە لە دایکی دەگێڕنەوە کە " کاتێک پاروویەکم دە زار دەنا ئەگەر شوبهەیەکی تێدابا، ئەو ئەوەند لە زگی دەکوتام هەتا ئەو پاروویەم داباوە دەر. "

ڕاستی ئەم قسەیە ئەوەیە کە:

لە **بایەزید**یان پرسی " چ بۆ پیاو باشترە دەو ڕێگایە دا؟ "

کوتی " دەوڵەتی زگماک! "

کوتیان " ئەگەر نەبێ؟ "

کوتی " دڵێکی زانا! "

کوتیان " ئەگەر نەبێ؟ "

کوتی " چاوێکی بینا! "

کوتیان " ئەگەر نەبێ؟ "

کوتی " گوێیەکی ژنەوا! "

کوتیان " ئەگەر نەبێ؟ "

کوتی "دەردی موفاجا! "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا هاتووە:

لە شێخیان پرسی " بۆ پیاو چ باشتر؟ "

کوتی " دەوڵەتی زگماک! "

کوتیان " ئەگەر نەبێ؟ "

کوتی " ئوستادی مورشید هەتا تەربیەتی بکا! "

کوتیان " ئەگەر نەیبینێتەوە؟ "

کوتی " مەرگی موفاجا " (ل ٣٤١)

٣.   دەگێڕنەوە کە:

کاتێک دایکی ناردییە بەر خوێندن و گەیشتە سوورەی **لوقمان**، بەم ئایەتە کە " ان اشکر لی ولوالدیک – هەقتەعالا دەڵێ: شوکری من بکە و شوکری دایک و باوک – لە مامۆستا مانای ئەو ئایەتەی پرسی. کاتێک مامۆستا ماناکەی کوت، شوێنی خستە سەر دڵی. لەوحی دانا و ئیزنی خواست و چۆوە ماڵ.

دایکی کوتی " یا **تەیفوور** بۆچی هاتوویەوە؟ شتێک قەوماوە یا دیارییەکیان هێناوە؟ "

کوتی " نا. گەیشتمە ئەم ئایەتە کە هەقتەعالا بۆ خزمەتی خۆی و خزمەتی تۆم بانگەواز دەکا. من دە دوو ماڵان دا چلۆن کەیخودایەتی بکەم؟ ئەم ئایەتە کەوتۆتە نێو گیانم. یا لە خودا داوا بکە کە گشت هی تۆ بم، یا من بە خودا ببەخشە هەتا گشت هی ئەو بم. "

دایک کوتی " تۆم دە کاری خودا کرد و هەقی خۆم بە تۆ بەخشی."

٤.

پاشان **بایەزید** لە **بەستام** ڕۆیشت و سی ساڵ لە بادیەی **شام** دەگەڕا و ریازەتی دەکێشا و بێخەویی و برسیایەتی کردە پیشەی هەمیشەیی. خزمەتی سەد و سێزدە پیری کرد و فایدەی لە هەموان وەرگرت. یەک لەوان **جەعفەری سادق** بوو.

دەگێڕنەوە کە:

ڕۆژێک لای **سادق** بوو. **سادق** کوتی " ئەو کتێبەم لە سەر رفە بۆ بێنە خوار! "

کوتی " کام رفە؟ "

**سادق** کوتی " ماوەیەکە هاتوچۆی ئێرەکانە دەکەی ئەو رفەت نەدیوە؟"



کوتی " نا! من چ کارم بەوە کە لە ئاست تۆ سەر هەڵبێنم؟ خۆ بۆ تەماشا نەهاتووم! "

**سادق** کوتی " کە وای لێهات بگەڕێوە **بەستام**. کاری تۆ تەواو بوو."

٥.   دەگێڕنەوە کە:

دوازدە ساڵی دەگرت هەتا گەیشتبا **کەعبە**. هەرچەند هەنگاوێک بەرماڵی ڕادەخست و دوو ڕەکەعەت نوێژی دەکرد و دەیکوت " ئەوە دالانی پادشای دونیا نییە کە تێیدا هەلینگ بدەی. "

پاشان چوو **کەعبە** و ئەو ساڵە نەچوو **مەدینە** و کوتی " ئەدەب نییە زیارەتی **پێغەمبەر** بخەینە سەر ئەم زیارەتە، بە جوێ ئیحرامی دەکەین. " گەڕاوە و ساڵێکی دیکە ئیحرامی کرد و لە ڕێگە کە دەهاتەوە شار، خەڵکێکی زۆر بوونە لاینگری. کە دەرکەوت خەڵک بە دوای دا دەرکەوتن. **بایەزید** ڕوانی و کوتی " ئەوانە کێن؟ "

کوتیان " ئەوانە دەگەڵ تۆ هاودەم دەبن. "

کوتی " خودایە! من لە تۆم دەوێ کە لەبەر خەڵک خۆت لە من مەحجووب نەکەی. " پاشان ویستی کە مەحەببەتی خۆی لە دڵی وان دەرباوێ و زەحمەتی خۆی لە سەر ڕێگەی وان هەڵگرێ. نوێژی بەیانی کرد و ڕوانیە وان و کوتی " بە ڕاستی خودام و جگە لە من خودایەک نییە، کەوایە من بپەرستن. " (انی انا الله، لا اله الا انا. فاعبدونی)

کوتیان " ئەو پیاوە دەبێ شێت بێ. "

جێیان هێشت و ڕۆیشتن.

--------------------

دە کتێبی شرح شطحیات دا وەها هاتووە:

ئەبوومووسا شاگردی بایەزید دەڵی کە:

دەگەڵ بایەزید بووم لە سەمەرقەند. خەڵکی شار تەبەرروکیان پێدەکرد. کاتێک لە شار دەرکەوتین، خەڵک بە دوای دا هاتن. کوتی " ئەوانە کێن؟"

کوتم " تەبەرروکخوازانن. "

وە سەر گردێک کەوت. ڕووی لەو قەومە کرد. کوتی " یا قەوم! انا ربکم الاعلی. "

ئەوان کوتیان " ئەبوویەزید شێت بووە. "

هەموو گەڕانەوە. (ل ٩٩)

٦.

پاشان لە ڕێ، کەللە سەرێکی دیتەوە. لە سەری نووسرابوو: **صم بکم عمی فهم لایرجعون. - لاڵ و کەڕ و کوێرن و ناگەڕێنەوە!** - نەعرەتەیەکی لێدا و کەوت و کەللەکەی ڕادەمووسی و دەیکوت " دەبێ سەری سۆفییەک بێ کە دە هەق دا مەحو بووە و بۆتە هیچ. نە گوێی هەیە کە بانگی هەق ببیسێ و نە چاوی هەیە کە جەمالی لایەزالی ببینێ و نە زمانی هەیە کە سەنای گەورەیی ئەو بکا و نە ئەقڵی هەیە کە زەڕڕەیەک لە مەعرەفەتی ئەو بزانێ. ئەم ئایەتە پڕ بە پێستی ئەو کەسەیە. "

٧. دەگێڕنەوە کە:

لە ڕێی حەج وشترێکی هەبوو کە تێشوو و تەڵمیتیان لێدەنا.

یەکێک کوتی " بەستەزمانە ئەو وشترە کە باری گرانە، ئەوەش زوڵمێکی تەواوە. "

**بایەزید** کوتی " ئەی جوامێر! هەڵگری بار وشتر نییە. بڕوانە! هیچ بارێک لە سەر پشتی وشترە؟ "



کە چاوی لێکرد بستێک لە سەرووی وشتر بوو. کوتی " سوبحانەڵلا، زۆر سەیرە! "

**بایەزید** کوتی " ئەگەر حاڵی خۆم لە ئێوە دەشارمەوە زمانی لۆمەم لێ درێژ دەکەن، ئەگەر ئاشکرای دەکەم، بەرگەی ناگرن. دەگەڵ ئێوە دەبێ چ بکەم؟ "

٨.

پاشان کە ڕۆیشت و **مەدینە**ی زیارەت کرد، بە خاتری داهات کە: بچۆ خزمەت دایکت! قاو کەوتە نێو **بەستام**. خەڵکی **بەستام** بەرەو پیری هاتن. **بایەزید** ئەگەر موراعاتی کردبان لە هەق دەماوە. کە گەیشتە شار نانێکی لە دوکانێک کڕێ و خەریکی خواردنی بوو. مانگی ڕەمەزان بوو – خەڵک کە وایانبینی، وێکڕا ڕەوینەوە. شێخ بە ئەسحابی کوت " بینیتان کە بە مەسەلەیەکی شەرعی کە بە کارم هێنا، گشت منیان ڕەد کردەوە! "

پاشان بەرەبەیان چوو بەر دەرگای ماڵە دایکی و گوێی هەڵخست. دەنگی دایکی گوێ لێبوو کە تەهارەتی دەگرت و دەیکوت " خودایا! ئاگات لەو غەریبەی من بێ و دڵی مەشایخی لێ خۆش بکە و ئەحواڵی باشی پێ کەرامەت بکە! "

**بایەزید** کە ئەمەی گوێ لێبوو، دەستی کرد بە گریان. پاشان لە دەرگای دا. دایک کوتی " کێیە؟ "

کوتی " غەریبی تۆ! "

دایک وە گریان کەوت و دەرگای هەڵگرت. پاشان کوتی " ئەی **تەیفوور**! چاوم سۆمای نەماوە ئەوەند کە بۆ دووریی تۆ گریاوم و پشتم چەماوەتەوە ئەوەند کە خەمی تۆم خواردووە. "

٩. دەگێڕنەوە کە:

کوتی " ئەوەیکە بە دوایین کارەکانم دادەنا، بەر لە هەموان بوو و ئەویش ڕەزای دایک بوو. " کوتی " ئەوەیکە لە گشت موجاهیدات و ریازات و غوربەت لێیدەگەڕام، دەو دا دیتمەوە. شەوێک دایکم داوای ئاوی لێکردم. گۆزە و جەڕە ئاویان تێدانەبوو. چوومە سەر کانی و ئاوم هێنا. دایکم خەوی لێکەوتبۆوە. شەوێکی سارد بوو. گۆزەم بە دەستەوە گرتبوو کە وە خەبەر هاتەوە، دوعای بۆ کردم. کاتێک بینی گۆزە بە دەستمەوە ڕەق بووە، کوتی: بۆ داتنەنا؟ کوتم: ترسام کە وە خەبەر بێی و من حازر نەبم.

جارێکی دیکەش کوتی: لایەکی دەرگا بکەوە!

تا بەیانی لێکمدەداوە کە نیوەی ڕاستی بکەمەوە یا نیوەی چەپ هەتا دژی فەرمانی دایکم نەکردبێ. لای بەرەبەیان ئەوەیکە لێی دەگەڕام لە دەرگا وە ژوور کەوت. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

بە بایەزیدیان کوت " بە چ شتێک گەیشتی بەوەی کە پێیگەیشتی؟ "

بایەزید کوتی " ئێوە چتان پێخۆشە بیڵێن بەڵام من هەمووی لەبەر خاتری ڕەزای دایک دەبینم. " (ل ١٥٧)

هەروەتر:

دایکی بایەزید شەوێک لە شەوەکان بەوی کوت " ئاوی بێنە! " بایەزید بۆ هێنانی ئاو دەرکەوت. کاتێک گەڕاوە دایکی خەوتوو بینی. گۆزە بە دەستەوە هەروا وەستا هەتا هەستاوە. کاتێک وەخەبەر هات کوتی " ئەی بایەزید کوا ئاو؟ "

بایەزید کوتی " ئەوەتا ئاو! "



دایک گۆزەی لە دەست بایەزید وەرگرت دە حاڵێک دا لە سەرمان گۆزە بە ئەنگوستی بایەزیدەوە نووسابوو و توێژێک لە پێستی ئەنگوستی بە دەسکی گۆزەوە مابۆوە. دایکی کاتێک وەهای بینی، لێیپرسی. بایەزید بۆی گێڕاوە و کوتی " ئەوە پێستی ئەنگوستی منە. دە دڵ دا کوتم ئەگەر گۆزە دابنێم و بڕۆم بخەوم لەوانەیە تۆ ئاوت بوێ و نەیبینی و تۆ بە منت نەکوت کە ئاو لە سەر ئەرز دابنێم، ئەوم بە دەستەوە گرت هەتا فەرمانی تۆم بە جێ گەیاندبێ و ڕەزایەتی تۆم پێکهێنابێ. "

دایکی کوتی " خودا لە تۆ ڕازی بێ! " (ل ١٥٦)

١٠. دەگێڕنەوە کە:

کاتێک لە **مەککە**وە دەهاتەوە، گەیشتە **هەمەدان**. تووی برژاوی کڕیبوو. هەندێکی لە خەرقەکەی بەست و هێنایە **بەستام**. کە کردییەوە چەند مێروولەی تێدا بینی. کوتی " ئەوانەم لە جێی خۆیان ئاوارە کردووە. " هەستا و ئەوانی بردەوە **هەمەدان** و لەو شوێنەی کە کونەکەیان بوو، دایانان.

١١. دەگێڕنەوە کە:

کوتی " دوازدە ساڵە ئاسنگەری نەفسی خۆم بووم. دە کوورەی ریازەتم دەنا و بە ئاگری موجاهیدە سوورم دەکردەوە و بە کوتکی مەلامەت دەمکوتاوە هەتا ئاوێنەیەکم لە خۆم ساز کرد. پێنج ساڵ ئاوێنەی خۆم بووم و بە هەمە چەشنە تاعەت و عیبادەت ئەو ئاوێنەیەم مشتوماڵ دەدا. پاش ساڵێک بە ئیعتبار نەزەرم لێکرد دە نێوقەدی خۆم دا لە غروور و عیشوە و باوەڕ بە تاعەت و عەمەلی خۆ خواستن، زوونارێکم بینی. پێنج ساڵی دیکەش هەوڵم دا هەتا ئەو زوونارە بڕا. ئیسلامم تازە کردەوە. هەموو خەڵکم مردوو هاتە بەرچاو.

چوار تەکبیرم بە سەر دا لێدان و لە جەنازەی هەموان گەڕامەوە و بەبێ زەحمەتی خەڵک بە یارمەتی هەق گەیشتمە هەق. "

--------------------

دە کتێبی ترجمە رسالە قشیریە دا وەها هاتووە:

بوویەزید کوتی " دوازدە ساڵ ئاسنگەری نەفسی خۆم بووم و پێنج ساڵ ئاوێنەی دڵی خۆم بووم و یەکساڵ دەمڕوانیە ئاوێنە، زونناریکم بینی لە نێوقەدی خۆم پەیدا. دوازدە ساڵ خەریکی بووم هەتا بڕیم. کە جارێکی دیکە ڕوانیم دە دەروونی خۆم دا زوننارێکم بینی. پێنج ساڵ هەوڵم دا کە چلۆنی ببڕم. ئاکام بۆم دەرکەوت، ڕوانیمە خەڵک هەمووم بە مردوو بینین. چوار تەکبیرم بۆ لێدان. " (ل ١٤٧)

## ١٢. دەگێڕنەوە کە:

جارێک تەمای حەجی گرت. چەند مەنزڵ ڕۆیشت و گەڕاوە. کوتیان "تۆ قەت لە تەمای خۆت نەگەڕاویەوە. چ قەوما؟"

کوتی " لە ڕێ دا قولێکم بینی شیر هەڵکێشراو، بە منی کوت: ئەگەر بگەڕییەوە باشە دەنا سەرت دەپەڕێنم. پاشان پێیکوتم: خودات لە **بەستام** جێ هێشتووە و ڕووت لە **کەعبە** ناوە! "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

بایەزید کوتی " بەرەو حەج وەڕێکەوتم. لە ڕێگە قولێکم بینی، بە منی کوت: ئەی بایەزید بۆ کوێ دەچی؟ کوتم: بۆ مەککە. کوتی: ئەوەی کە تەڵەبی دەکەی لە بەستام جێت هێشتووە و تۆ ئەوە نازانی. لەو دەگەڕێی لە حاڵێک دا ئەو لە ڕەگی ملت لە تۆ نزیکترە. " ل ١٨١

هەروەتر دیسان دەو کتێبە دا هاتووە کە:

بایەزید کوتی " یەکەم جار کە چوومە حەج ئاپوورەی خەڵک بە سەرم دا زاڵ بوو، جاری دووهەم چووم و ماڵ بە سەر من دا زاڵ بوو و سێهەم جاریش. جاری چوارەم



بەرەو ماڵ چووم، لە یەک لە مەنزڵەکان نەدایان کردمێ کە: ئەی بایەزید! بۆ کوێ دەچێ؟ کوتم: بەرەو ئەو. بانگی کردم کە: ئەوت لە بەستام جێ هێشتووە. ئەوسا لە خەوی غەفلەت بێدار بووم. " (ل ٢٧٥)

## ١٣. دەگێڕنەوە کە کوتی:

پیاوێک هاتە لام و پرسی " بۆ کوێ دەچێ؟ "

کوتم " بۆ حەج! "

کوتی " چت پێیە؟ "

کوتم " دووسەد درەم! "

کوتی " بیدە بە من و حەوت جار بە دەوری من دا بگەڕێ، کە حەجی تۆ ئەمەیە. "

وەهام کرد و گەڕامەوە.

--------------------

دە کتێبی مقالات شمس تبریزی دا وەها هاتووە:

ئەبایەزید دەچوو حەج و عادەتی وەها بوو کە دەگەیشتە هەر شارێک لە پێشدا دەچوو بۆ زیارەتی مەشایخ جا لە دوایی کاری دیکە. گەیشتە بەسرە. چوو خزمەت دەروێشێک.

کوتی " یا ئەبایەزید بۆ کوێ دەچی؟ "

کوتی " بۆ مەککە   بۆ زیارەتی ماڵی خودا! "

کوتی " توێشەی ڕێ چت پێیە؟ "

کوتی " دووسەد درەم! "

کوتی " هەستە و حەوت جار بە دەوری من دا تەواف بکە و ئەو پارە بدە بە من! "

هەستا و کیسەی لە بەر پشتبەند دەرهێنا، ماچی کرد و لە پێشی دانا.

کوتی " یا ئەبایەزید بۆ کوێ دەچی؟ ئەو ماڵی خودایە و ئەم دڵەی منیش ماڵی خودایە. بەڵام بەو خودایەی کە خاوەنی ئەو ماڵ و خاوەنی ئەم ماڵەیە، لەوەتی ئەو ماڵەیان بنیات ناوە نەچۆتە ئەو ماڵە و لەو ڕۆژەوە کە ئەم ماڵەیان ساز کردووە، لەم ماڵە خاڵی نەبووە. " (ب ١ ل ٢٦٤)

١٤.

کاتێک کاری تەواو بڵند بوو و قسەکانی لە حەوسەڵەی ئەهلی زاهیر دا نەدەگونجا، حەوت جار لە بەستام دەریان کرد. شێخ دەیکوت " بۆ دەرم دەکەن؟ "

کوتیان " چونکە پیاوێکی خراپی! "

کوتی " بژی شارێکی وا کە خراپەکەی **بایەزید** بێ! "

--------------------

دە کتێبی تلبیس ابلیس دا هاتووە:

خەڵکی بەستام ئەبوویەزیدیان دەر کرد چونکە ئیدعای دەکرد کە وەک پێغەمبەر مێعراجی هەبووە. جا چوو مەککە و دوای دوو ساڵ گەڕاوە و لە جورجان بوو هەتا حوسێن ئیبنی عیسا مرد، ئەوجار توانی بگەڕێتەوە بەستام. (ل ١٣٨)

هەروەتر دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا هاتووە کە:

لە شێخ ئەبوو عەبدوڵڵام بیست کە دەیکوت " بایەزیدیان لەو گەڕەکە دەر کرد و چوو گەڕەکی وافیدان... ئەوەی کە دەیڵێن هەندێکە لە زۆرێک. لە داعی عەلەوییم بیست کە بایەزیدیان حەوت جار لە بەستام تەبعید کرد. " (ل ١١٣)

١٥.

جارێک دە خەلوەت دا بە سەر زمانی داهات " سبحانی ما اعظم شانی " کە هاتەوە سەر خۆ، مریدەکانی کوتیان " تۆ وەها قسەیەکت کرد. "

کوتی " خودا لێتان ڕازی نەبێ ئەگەر جارێکی دیکە بیستتان من لەت و پەت نەکەن. " پاشان کێردێکی دا بە هەر کامیان هەتا جارێکی دیکە ئەگەر وایکوت بیکووژن.

وا ڕێککەوت کە جارێکی دیکە هەروای کوتەوە و ئەسحاب تەمای کوشتنیان گرت. ماڵیان پڕ لە **بایەزید** بینی، وەها کە هەر چوارگۆشەی



ماڵ لەو پڕ بوو. ئەسحاب کێردیان دەوەشاند، دەتکوت کێرد لە ئاو دەدەن. دوای سەعاتێک ئەو ڕوخسارانە چووک بوونەوە هەتا **بایەزید** دەرکەوت وەک چێشکەیەک لە مێحراب.

ئەسحاب ئەو حاڵەتەیان بۆ شێخ گێڕاوە. شێخ کوتی " **بایەزید** ئەمەیە کە دەیبینن، ئەو **بایەزید** نەبوو. "

١٦.

ڕۆژێک جەماعەتێک هاتنە لای شێخ. ئەو سەری داخست، پاشان سەری هەڵێنا و کوتی " لە بەیانییەوە لە دەنکێک دەگەڕێم کە بیدەم بە ئێوە کە تاقەتی هەڵگرتنیتان هەبێ و نایدۆزمەوە. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

عبید بن عبدالقاهر کوتی:

قەومێک لای بایەزید دانیشتبوون. بایەزید سەری داخست دوایە هەڵیهێناوە و کوتی "لەودەمەوە کە ئێوە لێرە دەگەڵ من دانیشتوون، بیرم وەگەڕ خستووە بۆ دیتنەوە دەنکێکی رزیو هەتا بۆ ئێوی بهێنم کە تاقەت هەڵگرتنتان هەبێ و نەمدۆزیوەتەوە. " (ل ٢٨٣)

### ١٧. دەگێڕنەوە کە:

**ئەبووتوراب** مریدێکی هەبوو گەلێک ڕووگەرم و سیاحەب وەجد بوو. **ئەبووتوراب** دایم دەیکوت کە " وەها کە تۆی، تۆ دەبێ **بایەزید** ببینی. "

ڕۆژێک مرید کوتی " کەسێک کە ڕۆژێ سەد جار خودای **بایەزید** دەبینێ، **بایەزید** چ لێبکا؟ "

**ئەبووتوراب** کوتی " کاتێک تۆ خودا دەبینی بە قەرا خۆتی دەبینی و کاتێک لای **بایەزید** ببینی بە قەرا بایەزیدی دەبینی. دە دیدە دا تەفاوەت هەیە. "

ئەو قسەیە کاری کردە سەر دڵی مرید و کوتی " هەستە با بڕۆین."

هەردووک چوونە **بەستام**. شێخ لە ماڵ نەبوو. بۆ ئاو هێنانێ چووبوو. ئەوان ڕۆیشتن. شێخیان بینی کە دێ، گۆزەیەکی ئاو بە دەستەوەیە و کەوڵێکی شڕی دە بەر دایە. کاتێک چاوی بایەزید بە مریدی **ئەبووتوراب** کەوت و چاوی مریدی **ئەبووتوراب** بە شێخ، کتوپڕ لەرزی و کەوت و گیانی دا.

**ئەبووتوراب** کوتی " ئەی شێخ! یەک نەزەر و مەرگ؟ "

شێخ کوتی " ئەی **ئەبووتوراب** دە دەروونی ئەو لاوە دا کارێک مابۆوە کە هێشتا وەختی کەشفی نەهاتبوو، بە دیتنی **بایەزید** ئەو مانایە کتوپڕ لێی کەشف بوو. تاقەتی نەهێنا، فەوتا. "

١٨.

**ئەحمەد ئیبنی حەرب** حەسیرێکی ناردە لای شێخ کە شەو نوێژی لە سەر بکا.

شێخ کوتی " من عیبادەتی ئاسمانییان و زەمینییانم دە باڵنج ناوە و وە بن سەرم داوە. "

--------------------

دە کتێبی شرح شطحیات دا وەها هاتووە:

ئەبووموسا دەڵێ کە:

ئەحمەدی حەرب حەسیرێکی بۆ ئەبوویەزید نارد، کوتی " دەمەوێ کە شەو لە سەر ئەوە نوێژ بکا. "



پەیامی نارد کە " عیبادەتی ئەهلی ئاسمان و زەوییم کۆ کردەوە و دە باڵنجێکم نا و ئەو باڵنجەم لە ژێر سەرم داناوە. " (ل ١٣٠)

هەروەتر دە کتێبی نورالعلوم دا وەها هاتووە:

ئەحمەدی حەرب بەڕماڵێکی بۆ بوویەزید نارد، کوتی " کاتێک شەو نوێژ دەکەی بیخە ژێر پێت. "

بوویەزید ناردیەوە و کوتی " باڵنجم بۆ بنێرە کە زوهدی هەر دوو کەونی تێدابێ هەتا دە بن سەرمی بنێم و بخەوم. " (ل ٧٩)

**١٩. دەگێڕنەوە کە:**

**یەحیا معاذ رازی** نامەیەکی نووسی بۆ **بایەزید** کە " دەڵێی چێ دە هەق کەسێک دا کە جامێکی خواردەوە و مەستی ئەزەل و ئەبەد بوو؟ "**بایەزید** نووسی " لێرە پیاو هەیە کە دە شەوڕۆژێک دا دەریای ئەزەل و ئەبەد پێدادەکا و نەعرەتەی **هل من مزید** لێدەدا."

--------------------

دە کتێبی کشف المحجوب دا هاتووە:

یەحیا ئیبنی مەعاز نامەیەکی بۆ بایەزید نووسی کە " دەڵێی چی لە سەر کەسێک کە بە دڵۆپێک لە بەحری مەحەببەت مەست بووە؟ "

بایەزید جوابی نووسیوە کە " دەڵێی چی لە سەر کەسێک کە تەواوی دەریاکانی عالەم ببنە شەرابی مەحەببەت هەمووی بخواتەوە و هێشتا لە تینوان بخرۆشێ؟ " (ل ٢٨٣)

هەروەتر دە کتێبی ترجمە رسالە قشیریە دا وەها هاتووە:

یەحیا ئیبنی مەعازی رازیی نامەیەکی نووسی بۆ بوویەزیدی بەستامیی کە " لێرە کەس هەیە کە ئەگەر قەدەحێک بخواتەوە هەرگیز تینوو نابێتەوە. "

بوویەزید جوابی نامەی بۆ نووسیوە کە " پێم سەیر بوو زەعیفی حاڵ کە لێرە کەس هەیە ئەگەر دەریاکانی عالەم بخواتەوە تێر نابێ و داوای زیادتر دەکا. " (ل ١١٥ )

هەروەتر دیسان دەو کتێبە دا دە لاپەڕەی ٥٦٦ دا هاتووە کە:

یەحیای ئیبنی مەعاز کوتی کە " نامەیەکم بۆ بوویەزید نووسی کە: ئەوەندم شەراب لە کاسەی مەحەببەتی ئەو خواردۆتەوە کە مەست بووم! "

بوویەزید دە جواب دا نووسی کە " جگە لە تۆ ئاسمان و زەوی، دەریا دەریایان خواردۆتەوە و هێشتا تێر نەبوون و زمانیان دەرکێشاوە و پتریان دەوێ. "

و ئەو بەیتەی کوت

| | |
|---|---|
| **عجبت لمن یقول ذکرت ربی** | **و هل انسی فاذکر مانسیت** |
| **شربت الحب کاسا بعد کاس** | **فما نفد الشراب و ما رویت** |

.٢٠

هەمدیسان **یەحیا** نووسیبووی کە " ئێمە دەگەڵ تۆ کە **بایەزیدی** ڕازێکمان هەیە، بەڵام دیداری من و تۆ بەهەشتە، لە ژێر سێبەری **تووبا**. " و نانێکی دەگەڵ ئەو نامەیە نادربوو و کوتبووی " دەبێ شێخ ئەم نانە بخوا کە بە ئاوی **زمزم** هەڵمشێلاوە. "

**بایەزید** جوابی داوە و ڕازەکەی ئەوی باس کرد و کوتی " لەو شوێنەی کە یادی هەق هەبێ، هەم بەهەشتە و هەم سێبەری **تووبا**. هەورەتر ئەو نانەمان نەخوارد چونکە نووسیبووت کە بە ئاوی **زمزم** هەڵتشێلاوە بەڵام نەتکوتبوو کە لە کام تۆو داچاندووە. "



.٢١

**زوننوونی میسریی** مریدێکی ناردە خزمەت **بایەزید** کە " ئەی **بایەزید!** تەواوی شەو دەخەوی و خەریکی ڕاحەت ڕابواردنی و قافڵە تێپەڕێ. " مرید هات و پەیامەکەی گەیاند.

**بایەزید** جوابی داوە " بە **زوننوون** بڵێ کە پیاوی تەواو ئەو کەسەیە کە تەواوەتی شەو خەوتبێ و بەیانی بەر لە بار خستنی قافڵە گەیشتبێتە مەنزڵ. "

**زوننوون** کاتێک ئەوەی بیست، گریا و کوتی " مەبارەکی بێ کە ئەحواڵی ئێمە بەم دەرەجەیە نەگەیشتووە. لەم بادیە تەریقەتی پێویستە و بەم شیوەیە، سلووکی دەروون. "

--------------------

دە کتێبی ترجمە رسالە قشیریە دا وەها هاتووە:

زوننوونی میسریی کەسێکی ناردە لای بوویەزید کەتی کە " هەتا کەی خەو و ڕاحەتیی خواستن، قافڵە تێپەڕی. "

بویەزید کوتی " بڵێ بە برام زوننوون، پیاو ئەوەیە کە شەو بخەوێ، بەیانی لە مەنزڵگا بێ و بەر لە قافڵە گەیشتبێ. "

زوننوون کوتی " نۆشت بێ ئەم قسەیە کە حاڵی ئێمە نەگەیشتۆتە ئەو ڕادەیە." (ل ٣١٦)

هەروەتر دە کتێبی عوارف المعارف دا وەها هاتووە:

زوننوونی میسریی پەیامی ناردە بایەزیدی بەستامیی کە " بەوەندەی کە خەوتین، قافڵە تێپەڕی. "

ئەو جوابی داوە کە " پیاو ئەوەیە کە تەواوەتی شەو بخەوێ و بەرەبەیان بەر لە قافڵە بگاتە مەنزڵ. "

زوننوون کوتی " ئەوە مەقامێکە کە ئەحواڵی ئێمە پێینەگەیشتووە. " (ل ٦١)

### ٢٢. دەگێڕنەوە کە:

**زوننوون** بەرماڵێکی نارده لای شێخ.

شێخ ناردیەوە کە " بەرماڵ بە چ کاری من دێ؟ پاڵپشتم دەوێ بینێرە هەتا پاڵێ وێدەم. " – یانی کار لە نوێژ تێپەڕیوە و گەیشتۆتە نەهایەت –

**زوننوون** کاتێک ئەمەی بیست پاڵپشتێکی دەست خست و ناردیە خزمەت شێخ.

شێخ دیسان ناردیەوە - کە شێخ ئەودەم گەرم داهاتبوو و پێست و ئێسکێکی مابوو – و کوتی " ئەو کەسەی کە پاڵپشتی لوتف و کەرەمی هەق بێ، بە نازباڵنجی خەڵک نانازێ و نیازی پێی نییە. "

### ٢٣. دەگێڕنەوە کە:

شێخ کوتی " یەکەم کەڕەت کە چوومە حەج، ماڵێکم بینی. دووهەم کەڕەت کە چووم، خاوەنماڵم بینی. سێهەم کەڕەت نە ماڵم بینی و نە خاوەنی ماڵ. "

یانی: وەها نوقمی هەق ببووم کە هیچ ئاگام نەدەکرد، ئەگەر بینیبام، هەقم دەبینی. بەڵگە لە سەر ئەو قسەیەش ئەوەیە کە یەکێک چوو ماڵەکەی و گازی کرد.

شێخ کوتی " کێت دەوێ؟ "

کوتی " **بایەزید!** "

کوتی " لە ماڵێ جگە لە خودا نییە. "

جارێکی دیکەش کەسێک چوو بەر دەرکی ماڵەکەی. شێخ کوتی " کێت دەوێ؟ "

کوتی " **بایەزید!** "



کوتی " بێچارە **بایەزید!** سی ساڵە لە **بایەزید** دەگەڕێم و ناوونیشانی نادۆزمەوە. "

ئەو قسەیان بۆ **زوننوون** گێڕاوە، کوتی " خودا برام **بایەزید** ببەخشێ کە دەگەڵ جەماعەتێک کە دە خودا دا ون بوون، ون بووە. "

--------------------

دە کتێبی کشف المحجوب دا هاتووە:

جارێک چوومە مەککە، ماڵم تەنیا بینی، کوتم: حەجی مەقبووڵ نییە کە من بەردی لەو جنسەم زۆر دیون. جارێکی دیکە چووم ماڵم بینی و خاوەنی ماڵم بینی کوتم: هێشتا هەقیقەتی تەوحید نییە. جاری سێهەم چووم هەر خاوەنی ماڵم بینی و ماڵ نا. بە سەرم دا نەدایان دا: یا بایەزید ئەگەر خۆت نەبینی و هەموو عالەم ببینی موشریک نی و کاتێک هەموو عالەم نابینی و خۆت دەبینی موشریکی. ئەوسا تۆبەم کرد و لەو تۆبەیەش تۆبەم کرد و لە بینینی وجوودی خۆشم تۆبەم کرد. (ل ١٦٤)

ئەبوویەزید ڕۆژێک لە سەومەعەکەی بوو، یەکێک هات و کوتی " ابویزید فی البیت؟ " فقال ابویزید " هل فی البیت الا الله؟ " یانی " بوویەزید لە ماڵە؟ " ئەو کوتی " دەو ماڵە دا جگە لە خودا هەیە؟ " (ل ٣٨٠)

هەروەتر دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا هاتووە:

یەکەم حەج کە بە جێم هێنا ماڵم بینی. جاریکی دیکە حەجم بە جێ هێنا، خاوەن ماڵم بینی و ماڵم نەبینی. جاری سێهەم حەجم بە جێ هێنا، نە ماڵم بینی و نە خاوەنی ماڵ. (ل ١٧١)

دە کتێبی ترجمە رسالە قشیریە دا وەها هاتووە:

دەگێڕنەوە کە:

زوننونی میسریی کەسێکی نارده لای بوویەزید هەتا خەبەری وی بۆ بپرسێ و سفەتی بزانێ. کابرا گەیشتە بەستام و لە ماڵی بوویەزیدی پرسی. چوو لای بوویەزید.

بوویەزید پرسی " چت دەوێ؟ "

کوتی " بوویەزیدم دەوێ. "

بوویەزید کوتی " بوویەزید کێیە؟ دەمێکە من لە بوویەزید دەگەڕێم."

کابرا هاتە دەر و کوتی " ئەوە شێتە. " چوو لای زوننوون و ئەو خەبەری پێدا کە بوویەزیدم چۆن بینی.

زوننوون گریا و کوتی " برای من بایەزید دەگەڵ کەسانێک کە دە خودا دا فانی بوون، فانی بووە. " (ل ١١٢)

**٢٤. دەگێڕنەوە کە:**

شەوێک شێخ بە گۆڕستان دا دەهات. لاوێکی گەورەماڵی **بەستام** بەربەتی دەژەنی. کاتێک گەیشتە لای شێخ، شێخ کوتی "لاحول و لا قوە الا بالله ". لاو بەربەتی لە سەری شێخ ڕاکێشا و هەردووک شکان.

شێخ گەڕاوە زاویەی و بەیانی زوو پارەی بەربەتی دا دەست خادم و تەبەکێکی هەڵوا ناردە لای ئەو لاوە و داوای لێبووردنی لێکرد و کوتی "پێیبڵێ کە **بایەزید** داوای لێبوردن دەکا و دەڵی کە دوێشەو ئەو بەربەتەت دە سەری ئێمە دا شکاند. ئەم قورازەیە وەرگرە و یەکی دیکە بکڕە و ئەم هەڵوایەش بخۆ هەتا خەمی شکان و تاڵاییەکەی دە دڵت دا نەمێنێ. "

**٢٥. دەگێڕنەوە کە:**

ڕۆژێک دەگەڵ ئەسحابەکانی خۆی دەڕۆیشت. سەگێک بە کۆڵانێکی تەنگ دا دەهات. شێخ گەڕاوە و ڕێگەی پێشکەشی سەگ کرد.

مریدێک ئینکاری بە خاتر داهات کە: هەقتەعالا بەشەری موککەرەم کردووە و شێخیش سوڵتانەلعارەفینە بەو هەموو پایگایە و کۆمەڵێک مردیدی سادق، سەگێکی وە پێش وان دا. ئەمە دەبێ چۆن بێ؟



شێخ کوتی " ئازیزان! سەگ بە زمانی حاڵ کوتی کە: لە کۆنی کۆن دا لە من چ تەقسیر و لە تۆ چ تۆفیرێک ڕووی دا کە کەوڵی سەگیان دە بەر من کرد و خەڵاتی سوڵتانەلعارەفینیان بە تۆ دادا؟ ئەم بیرەم هاتە نێو زەینەوە، ڕێگەم پێشکەش کرد. "

**٢٦. دەگێڕنەوە کە:**

ڕۆژێک دەڕۆیشت. سەگێک ڕەگەڵی کەوت و شێخ تەشک و داوێنی خڕ کردەوە. سەگ کوتی " ئەگەر ویشک بم دە نێوان من و تۆ دا خەلەلێک نییە و ئەگەریش تەڕ بم، حەوت ئاو و خاک ئاشتمان دەکەنەوە. بەڵام ئەگەر تۆ تەشکت خڕ بکەیەوە ئەگەر بە حەوت دەریایان غوسڵ بکەی، پاک نابیەوە. "

**بایەزید** کوتی " تۆ ڕواڵەتت گڵاوە و من دەروونم گڵاوە. وەرە هەتا هەردووکیان جەمع بکەینەوە هەتا بە هۆی جەمعیەت، پاکیی دە نێوانمان دا دەربکەوێ. "

سەگ کوتی " تۆ بۆ هاوڕێیەتی من ناشی. چونکە من مەردوودی خەڵکم و تۆ مەقبوول. هەرکەس بگاتە من بەردێکم دە قەبرغە دەگرێ و هەرکەس بگاتە تۆ ئەسسەلاموعەلەیک یا سوڵتانەلعارەفینت پێدەڵێ. ئەوجار من هەرگیز ئێسکێکم بۆ سبەی پاشەکەوت نەکردووە و تۆ کووپەکت گەنم هەیە. "

**بایەزید** کوتی " شایەنی هاوڕێیەتی سەگێک نیم، کوا شایەنی لەم یەزال و لایەزال دەبم؟ "

٢٧. **کوتی:**

شکێکم تێدا پێکهات و لە تاعەت هیوام بڕی. کوتم بلا بچمە بازاڕ و زوونناریێک بکڕم و لە نێوقەدمی بدەم. زوونناریێکیان لە بازاڕ هەڵواسیبوو. پرسیم کە " بە چەند؟ "

کوتی " هەزار دینار! "

سەرم بەرداوە.

هاتفێک دەنگی هات کە " نەتزانیوە کە زوونناریێکی کە لە نێوقەدی کەسێکی وەک تۆ بدرێ، لە هەزاری کەمتر نادەین. "

دڵم خۆش بوو. زانیم کە هەقتەعالا عینایەتێکی هەیە لە هەق من دا.

٢٨. **دەگێڕنەوە کە:**

زاهیدێک بوو لە ریزی گەورەکانی **بەستام**، خاوەن تەبع و خاوەن قبووڵ و لە ئاڵقەی **بایەزید** غایب نەدەبوو. ڕۆژێک کوتی " ئەی شێخ! سی ساڵە هەمیشە بەڕۆژووم و شەونخوونی دەکێشم و لەو عیلمەی کە تۆ باسی دەکەی هیچ نابینم هەرچەند قەبووڵی دەکەم و پێمخۆشە. "

شێخ کوتی " ئەگەر سێسەد ساڵ بەڕۆژوو بی و نوێژ بکەی، زەڕڕەیێک بۆنی ئەو حەدیسەت پێناگا. "

کوتی " بۆچی؟ "

کوتی " چونکە تۆ مەحجووبی بە نەفسی خۆت. "

کوتی " دەرمانێک هەیە؟ "

شێخ کوتی " لای من هەیە کە پێتبڵێم بەڵام تۆ قەبووڵی ناکەی. "

کوتی " قەبووڵی دەکەم کە گەلێک ساڵە داوای دەکەم. "



شێخ کوتی " هەر ئێستا بڕۆ مووی سەر و ردێنت بکەوە و بیتاشە و ئەم جلەی کە دە بەرت دایە، دایکەنە و فۆتەیەکی زوور لە خۆت ببەستە. بچۆ ئەو گەڕەکەی کە تۆ باشتر دەناسن. توورەکەیەک پڕ لە گوێز بکە و لە کن خۆتی دابنێ. منداڵەورکە کۆ بکەوە و بڵێ کە: هەرکەس زللەیەکم لێدا گوێزێکی دەدەمێ و هەرکەس دوو زللەم لێدا، دوو گوێزی دەدەمێ. بە شار دا بگەڕێ هەتا منداڵ ئیشت لە پژملی بدەن، کە عیلاجی کاری تۆ ئەمەیە. "

پیاو کوتی " سوبحانەڵڵا! لا اله الا الله! "

شێخ کوتی " ئەگەر کافرێک ئەو وتەیە بڵێ، دەبێتە خاوەن ئیمان و تۆ بەم وتەیە بوویە موشریک. "

کوتی " بۆ؟ "

شێخ کوتی " چونکە تۆ بەم وتەیە تەعزیمی خۆت دەربڕی نەک تەعزیمی هەق. "

پیاو کوتی " ئەوەی ناتوانم بکەم، بە کەسێکی دیکەی بفەرموو. "

شێخ کوتی " عیلاجی تۆ ئەمەیە و من کوتم کە نایکەی. "

٢٩. **دەگێڕنەوە کە:**

شاگردێکی **شەقیق** تەمای حەجی گرت.

**شەقیق** کوتی " بە **بەستام** دا بڕۆ و زیارەتی شێخ بکە. "

کاتێک مرید گەیشتە خزمەت **بایەزید**، شێخ کوتی " تۆ مریدی کێی؟"

کوتی " من مریدی **شەقیقی بەلخیی** -م. "

کوتی " ئەو دەڵێ چێ؟ "

کوتی " ئەو لە خەڵک هەڵبڕاوە و بە حوکمی تەوەککول دانیشتووە و دەڵێ: ئەگەر ئاسمان و زەوی ببنە فافۆن و ئاسن وەها کە نە لە

ئاسمان بباریّ و نە لە زەوی بڕسکیّ و خەڵک هەموو خاو و خێزانی من بن، لە تەوەککولی خۆم پاشگەز نابمەوە. "

**بایەزید** کوتی " ئەوە موشریکێکی گەلێک گرانە! ئەگەر **بایەزید** ببێتە قالاوێک بۆ شاری ئەو موشریکە نافڕیّ. کاتێک گەڕایەوە پێیبڵیّ کە: خودا بە دوو کوتە نان بە تاقی مەکەوە. وەختایەک کە برسیت بوو لە هاوجنسێکت دوو نان وەربگرە و بارنامەی تەوەککول وەلا بنیّ هەتا لە نەکبەتیی تۆ شار و ویلایەت نەچنە بن عەرزەوە. "

ئەو پیاوە لەبەر ئەو قسە زلە گەڕاوە و چوو لای **شەقیق**.

**شەقیق** کوتی " زوو گەڕایەوە؟ "

کوتی " تۆ کوتبووت کە بچمە زیارەتی وی. چووم وەها و وەها قەوما. " و حەکایەتەکەی گێڕاوە.

**شەقیق** عەیبی ئەو قسەی دە خۆی دا بینی، کوتی " تۆ نەتکوت کە: ئەگەر ئەو وەهایە، تۆ چۆنی؟ "

کوتی " نا! "

کوتی " بگەڕێوە و بپرسە! "

مرید گەڕاوە و چوو لای **بایەزید**.

شێخ کوتی " ها گەڕایەوە؟ "

کوتی " منیان ناردووە هەتا لە تۆ بپرسم کە: ئەگەر ئەو وەهایە، تۆ چۆنی؟"

**بایەزید** کوتی " نەزانییەکی دیکە سەیر بکە. " پاشان کوتی " ئەگەر من بڵێم کە چۆنم، تۆ تێناگەی. "

کوتی " شێخ ئەگەر بە مەسڵەحەتی دەزانیّ، بفەرموون لە شوێنێکی بینووسن، هەتا ڕۆژگاری من بە زایە نەچی کە لە ڕێگەیەکی دوورەوە هاتووم. "



شێخ کوتی "بسم الله الرحمن الرحیم، **بایەزید** ئەمەیە. " و کاغەزی پێچاوە و دای بەو. یانی **بایەزید** هیچ نییە. مەوسووفێک نییە چلۆن دەکریّ وەسفی بکەی؟ **بایەزید** زەڕڕەیەکیش نییە چ بگا بەوەیکە بپرسن: ئەو چلۆنە؟ تەوەککولی هەیە یا ئیخلاس؟ کە ئەمانە هەموو سفەتی خەڵکن. تخلقوا باخلاق الله پێویستە، نەک بە تەوەککول، بوون بە شتێک.

مرید ڕۆیشت.

**شەقیق** نەخۆش کەوتبوو و ئەجەلی نزیک ببۆوە و چاوەڕوانیی جوابی **بایەزیدی** دەکرد. لە نەکاو مرید گەیشتیّ و کاغەزی دایە. **شەقیق** کە خوێندیەوە کوتی " اشهد ان لا اله الا الله و اشهد ان محمد عبده و رسوله" پاک بۆوە لە عەیبی باوەڕی خۆی. تۆبەی کرد و گیانی دا.

### ٣٠. دەگێڕنەوە کە:

هەزار مریدی **ئەحمەد ئیبنی خەزرووییە** هاتنە لای **بایەزید**، وەها کە هەر هەزار بە سەر ئاو دا دەڕۆیشتن و بە هەوا دا دەفڕین. **ئەحمەد** کوتی "هەرکام لە ئێوە تاقەتی بینی **بایەزید**تان هەیە بیّ، دەنا لە دەرەوە بن هەتا ئێمە بچین و زیارەتی بکەین. "

هەر هەزار وە ژوور کەوتن و هەرکام گۆچانێکیان پێبوو، لە پاشخانەیان دانا کە پێیاندەکوت ژووری گۆچانان. یەک لەوان کوتی " من تاقەتی دیداری ئەوم نییە. من لێرە ئاگام لە گۆچانان دەبیّ. "

کاتێک شێخ و ئەسحاب چوونە لای **بایەزید**. **بایەزید** کوتی " ئەوەی کە باشترینی ئێوەیە، بەو بڵێن بێتە ژووریّ. "

هێنایان.

**بایەزید** بە **ئەحمەدی** کوت " هەتاکەی سیاحەت و بە دەوری عالەم دا گەڕان؟ "

**ئەحمەد** کوتی " ئاو ئەگەر لە شوێنێک بوەستێ، گۆڕانی بە سەر دادێ! "

شێخ کوتی " بۆ نەبیە دەریا هەتا نەگۆڕێی و پیسایی وە خۆ نەگری؟ "

پاشان **بایەزید** دەستی بە قسە کرد. **ئەحمەد** کوتی " وەرە خوارتر کە ئێمە تێیناگەین. " هەتا حەوت جار. ئەودەم دە قسەی **بایەزید** گەیشتن.

کاتێک **بایەزید** بێدەنگ بوو، ئەحمەد کوتی " یا شێخ! ئیبلیسم بینی لە سەری کۆڵان لە دار دراوە. "

کوتی " ئادی، بەڵێنی دابوو کە لە **بەستام** نەگەڕێ، ئێستاش یەکێکی وەسوەسە کرد هەتا دە خوێنی وەردا. شەرتیشە کە دز لە بەر دەرگای پادشا لە دار بدەن. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کەسێک لە بایەزیدی پرسی " مریدان لە تەڵەب ئارام ناگرن. "

بایەزید کوتی " هاونشینی من موقیمە و مسافر نییە من دەگەڵ ئەو موقیمم نەک دە سەفەر دا. "

پاشان بایەزید کوتی " چ دەڵیی سەبارەت بە ئاوی دەریا؟ مەگەر ڕەسووڵ نەیکوتووە کە ئاوی دەریا خاوێنە و مردارەکەشی حەڵاڵ. ڕووبارەکان دەبینی کە بەڕیوەن و دەهاژێنن و هاوار دەکەن هەتا لە دەریا نزیک دەبنەوە، کاتێک تێکەڵ بە دەریا بن ئارام دەگرن و خامۆش دەبن و دەریا ئاگای لە حوزووری وی نییە. نە شتێک لە دەریا زیاد دەکا و ئەگەر دەر بکەوێتەوە شتێکی لێ کەم ناکا. " پاشان کوتی " داستانی تۆ دە نێو پیاوان دا داستانی



سێڵاوە و دەریا. چونکە سێڵاو هەتا تەنیایە بانگ و هاواری هەیە. کاتێک بگاتە دەریا و تێکەڵ بە دەریا بێ لەو بانگ و هاوارە، ئارام دەگرێ و دەریا خەبەری لەو نییە. نە لە دەریای زیاد کردووە و نە ئەگەر بگەڕێتەوە شتێک لەو کەم دەکاتەوە. " (ل ٢٦٧)

هەروەتر دە تفسیر کشف الاسرار دا هاتووە:

کەسێک بە بایەزیدی کوت " بۆ هیجرەت ناکەی و بۆ سەفەر دەرناکەوی هەتا فایدە بە خەڵک بگەیەنی؟ "

کوتی " دۆستم موقیمە و خەریکی ویم و بە ئیدیکە ڕاناگەم. "

ئەو پیاوە کوتی " ئاو کە لە جێگەیەک بمێنێتەوە بۆگەن دەبێ. "

بایەزید کوتی " دەریا بە هەتا قەت بۆگەن نەبی. " (ب ١ ل ٢١٥)

٣١.

**ئەحمەدی خەزروویە** بەرگی وەک لەشکرییان دەپۆشی و **فاتمە** کە خێزانی ئەو بوو دە تەریقەت دا ئایەتێک بوو و لە کچەکانی میری **بەلخ** بوو و تۆبەی کرد و کەسێکی ناردە لای **ئەحمەد** کە: من لە باوکم بخوازە. **ئەحمەد** جوابی نەداوە. جارێکی دیکە کەسی نارد کە: ئەی **ئەحمەد!** من تۆم لەوە پێ پیاوتر بوو کە ڕێگەی هەق لێبدەی، ڕێبەر بە نەک ڕێگر. "

جا **ئەحمەد** کەسی نارد و ئەوی لە باوکی خواست. باوک بە حەکمی تەبەررووک ئەوی دا بە **ئەحمەد**. **فاتمە** تەرکی کاری دونیایی کرد و خانەنشین دەگەڵ **ئەحمەد** دەژیا؛ هەتا ئەحمەد وە تەمای زیارەتی **بایەزیدی** کەوت. **فاتمە** دەگەڵی چوو. کاتێک چوونە لای **بایەزید** **فاتمە** نیقابی لە بەر ڕوو لابرد و دەگەڵ **بایەزید** گوستاخ و خۆمانە دەدوا. **ئەحمەد** ئەوەی پێ سەیر بوو و غەیرەت بە دڵی داهات، کوتی " ئەی **فاتمە** ئەوە چ گوستاخییەکە دەگەڵ **بایەزید** دەیکەی؟ "

**فاتمە** کوتی " لەبەر ئەوەکە تۆ مەحرەمی تەبیعەتی منی و **بایەزید** مەحرەمی تەریقەت من. لە تۆ بە هەوا دەگەم و لەو بە خودا و دەلیلی ئەو قسەیەشم ئەوەیە کە ئەو لە قسەی من بێنیازە و تۆ بە من موحتاجی. "

**بایەزید** هەمیشە دەگەڵ **فاتمە** گوستاخ بوو هەتا ڕۆژێک **بایەزید** چاوی کەوتە سەر دەستی **فاتمە**، خەنەی لێدابوو، کوتی " یا **فاتمە**! بۆچ خەنەت لێداوە؟"

کوتی " ئەی **بایەزید**! هەتا ئەو غایەتەی تۆ دەست و خەنەی منت نەدیبوو من دەگەڵ تۆ خۆمانە و کراوە بووم ئێستا کە چاوت بەوانە کەوت قسەی ئێمە دەگەڵ تۆ حەرامە. "

--------------------

عەتتار ئەو باسەی وشە بە وشە لە کتێبی کشف المحجوب وەرگرتوە (ل ١٨٣) و باقییەکەی وەهایە: ... کاتێک یەحیا ئیبنی مەعازی رازیی لە رەی هاتە نەیشابوور و بە تەمای بەلخ بوو، ئەحمەد ویستی هەتا ئەو بانگێشتن بکا. لە فاتمە مشووری خواست کە " بۆ دەعوەتی یەحیا دەڵێ چی. " کوتی " چەند سەر گا و مەڕ و کەرەسە و بەهارات و شەمع و عەتر و هەروەتر بیست سەر کەر دەبێ بکووژیەوە. " ئەحمەد کوتی "کوشتنەوەی کەران چ مانایەکی هەیە؟ " کوتی " وەختایەک کەریمێک لە ماڵی کەریمێک میوان بێ نابێ سەگەکانی گەڕەکیش خەبەریان لەوە هەبێ؟ " و ئەبوویەزید کوتی "هەرکەس دەیەوێ پیاوێک ببینێ شاراوە بە جلی ژنان بڵا بڕوانێتە فاتمە " (ل ١٨٤)

هەروەتر دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا هاتووە:

[فاتمە] ئوممی عەلی کچێکی گەورەماڵان بوو. ئەو مارەیی خۆی کە دە هەزار دینار بوو بە مێردەکەی خۆی ئەحمەد ئیبنی خەزروویەی بەلخیی مەروەزیی بەخشی بەو شەرتەی کە ئەو بەرێتە لای بایەزید. ئەو ئوممی عەلی بردە لای بایەزید. جا لە بایەزید وە ژوور کەوت و لە بەرابەری دانیشت. پەردەی لە ڕوخساری هەڵگرت. هاوسەرەکەی ئەحمەد پێیکوت: شتێکی سەیریت لێدەبینم! لە ئاست بایەزید پەردەی لە سەر ڕووت لابردووە؟ ئوممی عەلی



کوتی: چونکە کاتێک چاوم لەو کرد هەموو لەززەتەکانی نەفسی خۆم ون کرد و کاتێک چاو لە تۆ دەکەم دەگەڕێمەوە سەر لەززەتەکانی نەفسی خۆم.

کاتێک هاتنە دەر ئەحمەد بە بایەزیدی کوت: وەسیەتێکم بکە!

بایەزید کوتی " جوامێریی لە خێزانی خۆت فێر بە! " (ل ٢٨٧)

### ٣٢. ئەحمەدی خەزروویە کوتی:

جارێک بە تەوەککول بەرەو حەج وە بادیە کەوتم. هەندێک ڕۆیشتم دڕکێک دە پێم چەقی. دەرمنەکێشاوە. کوتم " تەوەککول باتڵ دەبێ. " هەروا دەڕۆیشتم. پێم هەڵمسا دیسان دەرمنەکێشاوە. هەروا بە شەلەشەل چوومە **مەککە** و حەجم کرد و گەڕامەوە. تەواوی ڕێ ئازارم هەبوو. خەڵک کە وەهایان بینیم دڕکیان لە پێ دەرکێشام. بە پێی بریندار ڕووم لە **بەستام** نا، چوومە لای **بایەزید**. **بایەزید** چاوی بە من کەوت، بزەیەکی هات و کوتی " ئەو پابەندەی کە لە پێیان نای، چت لێکرد؟ "

کوتم " ئیختیاری خۆم دە ئیختیار ئەو نا. "

کوتی " ئەی موشریک! دەڵێی: ئیختیاری من! یانی تۆش وجوودێکت هەیە و ئیختیارێکت هەیە؟ ئەوە شیرک نییە؟ "

### ٣٣. دەگێڕنەوە کە کوتی:

شەوێک خەونم بینی کە فریشتەکانی ئاسمانی یەکەم هاتنە لای من و کوتیان " هەستە هەتا یادی خودا بکەین! "

کوتم " من زمانی زیکری ویم نییە. "

فریشتەکانی ئاسمانی دووهەم هاتن و هەر ئەمەیان کوت و من هەمان جوابم داوە هەتا فریشتەکانی حەوت ئاسمان هاتن و من هەمان جوابم داوە. "

کوتیان " ئەی کەی زمانی زیکری ویت دەبێ؟ "

کوتم " ئەودەم کە ئەهلی دۆزەخ لە دۆزەخ نیشتەجێ بن و ئەهلی بەهەشت لە بەهەشت و قیامەت تێپەڕێ، **بایەزید** بە دەوری عەرشی خودا دا بگەڕێ و بڵێ: ئەڵڵا ئەڵڵا "

### ٣٤. هەروەتر کوتی:

شەوێک ماڵەکەم ڕووناک بوو. کوتم " ئەگەر شەیتانی من لەوە عەزیزترم و هیممەت بەرزتر کە تۆ تەماحم تێبکەی. ئەگەریش لە گەورەکانی بڵا لە سەرای خزمەت بگەینە سەرای کەرامەت. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

شەوێک بایەزید نوێژی دەکرد، ماڵ ڕووناک بوو هەروەک نیوەڕۆ. بایەزید کوتی "ئەگەر شەیتانی من عەزیزتر و پایەبەرزتر لەوەم کە تەماحم تێبکەی و ئەگەر لە لایەن خودای تەعالاوەیە لەو داوا دەکەم کە ئەمە لەم سەرای خزمەتەوە بۆ سەرای کەرامەت وەدوا بخا. " (ل ٢٢٢)



### ٣٥. دەگێڕنەوە کە:

شەوێک زەوقی عیبادەتی تێداپێکنەدەهات، بە خادمی کوت " بڕوانە کە ماڵ چی تێدایە؟ " گەڕان. هێشوویەک ترێیان دیتەوە. کوتی " بیدەن بە کەسێک کە ماڵ ئێمە دوکانی بەققاڵی نییە. " هەتا زەوقی کراوە.

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

شەوێک بایەزید لە سەرەتای کاری، وەک شەوانی دیکە ئەو شیرینایی تاعەتی تێداپێکنەدەهات، بە ئەبووموووسای کوت " بزانە هیچ خواردەمەنییەک دە ماڵ دا دەبینیەوە؟ " ئەبووموووسا چوو و ڕوانی و نیوە هێشوویەکی ترێ دیتەوە و بایەزیدی ئاگادار کرد. بایەزید کوتی " بیدە بە کەسێک کە ماڵی ئێمە وەک دوکانی بەققاڵانی لێهاتووە. "(ل ١٥٤)

### ٣٦. دەگێڕنەوە کە:

شێخ هاوسایەکی گاوری هەبوو کە منداڵێکی شیرەخۆرەی هەبوو و تەواوەتی شەو لەبەر تاریکی دەگریا، کە چرایان نەبوو.

شێخ هەموو شەوێ چرای هەڵدەگرت و دەیبردە ماڵە وان هەتا منداڵ ژیر دەبۆوە. کاتێک گاور لە سەفەر هاتەوە، دایکی منداڵ حەکایەتی شێخی بۆ گێڕاوە.

گاور کوتی " کە ڕووناکی شێخ هات حەیفە بگەڕێینەوە سەر تاریکی خۆمان. " هات و بوو بە موسڵمان.

**٣٧. دەگێڕنەوە کە:**

بە گاورێکیان کوت " ببە بە موسڵمان. "

کوتی " ئەگەر موسڵمانەتی ئەمەیە کە **بایەزید** هەیەتی، من تاقەتم نییە و پێمناکرێ. ئەگەر ئەمەیە کە ئێوە هەتانە، چ ئیحتیاجم بەمە نییە."

**٣٨. دەگێڕنەوە کە:**

مونکرێک هاتە لای و کوتی " فڵان مەسەلەم لێ ئاشکرا بکە. "

شێخ ئەو ئینکارەی تێدا بەدی کرد. کوتی " برۆ فڵانە ئەشکەوت و دۆستێکی ئێمە لەوێیە، لەو پرسە هەتا لێت کەشف بکا. "

هەستا و چوو ئەو ئەشکەوتە. ئەژدیهایەکی بینی گەلێک سامناک. کە چاوی پێکەوت لە خۆ چوو و خۆی پیس کرد و گێژ خۆی خستە دەرەوە و کەوشی جێ هێشت و گەڕاوە لای شێخ، بە پێی داکەوت و تۆبەی کرد.

شێخ کوتی " سوبحانەڵڵا! تۆ ناتوانی کەوشت ڕابگری و تەهارەت لە سامی مەخلووقێک، لە هەیبەتی خالەق دا چلۆن دەتوانی کەشف ڕابگری کە بە ئینکارەوە هاتووی کە: فڵانە قسەم لێ کەشف بکە؟ "

**٣٩. دەگێڕنەوە کە:**

ویشکەزاهیدێک ئینکاری هەبوو لە هەق شێخ دا، کە لەو کاری عەزیمی دەبینی و ئەو بێچارەیە مەحرووم، کوتی " ئەو مەعامله و ریازەتە کە ئەو دەیکا، منیش دەیکەم و ئەو قسەی وا دەکا کە لای مەمانان بێگانەیە. "

شێخ ئاگای لەوانە بوو. ڕۆژێک تەمای شێخی کرد. شێخ نەفەسێکی حەواڵەی ئەو ویشکەزاهیدە کرد. ویشکەزاهید سێ ڕۆژ لە خۆ چوو و خۆی پیس کرد. غوسڵی کرد و بۆ داوای لێبوردوون هاتە لای شێخ.

شێخ کوتی " نەتزانیوە کە باری فیلان ناخەنە سەر پشتی کەران؟ "



**٤٠. دەگێڕنەوە کە:**

شێخ **سەعیدی مەیخورانی** هاتە لای **بایەزید** و دەیەویست هەتا ئیمتەحانێکی بکا. ئەوی حەواڵەی مریدێک کرد، ناوی **ئەبووسەعیدی راعی**. کوتی " برۆ لای ئەو کە ویلایەتی کەرامەتمان بەو بەخشیوە. "

کاتێک **سەعید** گەیشتە وێ، **راعی** بینی لە سەحرا کە نوێژ دەکا و گورگەکان شوانیەتی مەڕەکانی ویان دەکرد. کە لە نوێژ بۆوە کوتی " چت دەوێ؟ "

کوتی " نانی گەرم و ترێ! "

**راعی** داردەستێکی پێبوو. دوولەتی کرد. لەتێکی لە لای خۆ چەقاند و لەتێک لە لای ئەو. دەسبەجێ ترێی بەر دا. لای **راعی** سپی و لای ئەو ڕەش. کوتی " بۆ لای تۆ سپی و لای من ڕەشە؟ "

**راعی** کوتی " چونکە من لە یەقینەوە داوام کرد و تۆ لە ڕێگەی ئیمتەحانەوە. هەر ڕەنگێکیش لایقی حاڵی ئەو دەبێ. "

**٤١. دەگێڕنەوە کە:**

لە **بایەزیدیان** پرسی " پیری تۆ کێ بوو؟ "

کوتی " پیرێژنێک. ڕۆژێک لە غەڵەبەی شەوق و تەوحید دابووم، وەها کە موویەکم نەدەبوارد. چوومە سەحرا ئاگالەخۆبڕاو. پیرێژنێک بە هەنبانەیەک ئاردەوە گەیشتێ. بە منی کوت: ئەو هەنبانەم بۆ هەڵگرە! – و من وەها بووم کە نەمدەتوانی خۆم هەڵگرم – ئیشارەم بە شێرێک کرد هات. هەنبانەم لە پشت نا و بە پیرێژنم کوت: ئەگەر چوویەوە شار دەڵێی کێم دیوە؟ - کە نەمدەویست بزانێ من کێم. – کوتی: دەڵێم زاڵمێکی ڕەعنام دیوە. پاشان کوتم: ئەوە دەڵێی چێ؟ پیرێژن کوتی: ئەو شێرە تەکلیفی

له سەرە یا نا؟ کوتم: نا! کوتی: ئەوەی کە خودا تەکلیفی لێنەکردووە تۆ تەکلیفت لێکرد، ئەوە زوڵم نییە؟ کوتم: هەیە - و سەرەڕای هەموو ئەوانە دەتەوێ کە خەڵکی شار بزانن کە لە ژێر ئەمری تۆ دایە و تۆ خاوەن کەراماتی، ئەوە غروور و ڕەعنایی نییە؟ کوتم: بەڵێ. تۆبەم کرد و لە ئەعلاوە هاتمەوە ئەسفەل. ئەو قسەیە پیری من بوو. "

### ٤٢. دەگێڕنەوە کە:

شێخ **شەقیقی بەلخیی** و **ئەبووتورابی نەخشەبی** هاتنە لای شێخ. شێخ داوای تەعامی کرد. یەک لە مریدەکانی شێخ لە خزمەت دا وەستابوو. **ئەبووتوراب** کوتی: وەرە ڕەگەڵمان بکەوە! "

کوتی " بەڕۆژووم! "

کوتی " بخۆ و سەوابی یەک مانگە وەربگرە! "

کوتی " ناکرێ ڕۆژووی بشکێنم! "

**شەقیق** کوتی " ڕۆژووی بشکێنە و هەقدەستی یەکساڵە وەبگرە! "

کوتی " ناکرێ بیشکێنم! "

**بایەزید** کوتی " لێیگەڕێ کە ئەو دەرکراوی حەزرەتە. "

هێندەی پێنەچوو کە لە سەر دزێیەتی گرتیان و هەردووک دەستیان بڕی.



### ٤٣. دەگێڕنەوە کە:

ڕۆژێک لە جامیع گۆچانی دە عەرز چەقاندبوو. کەوت و وە گۆچانی پیرێک کەوت. ئەو پیرە داهاتەوە و گۆچانی شێخی هەڵگرتەوە. شێخ چووماڵەکەی و حەلاڵیی لێخواست و کوتی " پشتت چەماندەوە لە هەڵگرتنەوەی گۆچان دا! "

--------------------

دە کتێبی ترجمە رسالە قشیریە دا وەها هاتووە:

بوویەزید چوو جامیع گۆچانی دە زەوی چەقاند، پیرێکی دیکەش گۆچانی چەقاندبوو. گۆچانی بوویەزید وە گۆچانی ئەو کابرایە کەوت. پیر داهاتەوە گۆچانەکەی هەڵگرتەوە. بوویەزید چوو ماڵی ئەو پیرە و گەردنازایی لێخواست، کوتی " لەبەر گۆچانی من بوو کە تۆ پشتت داهێناوە. " (ل ١٦٣)

### ٤٤. دەگێڕنەوە کە:

یەکێک وە ژوور کەوت و لە سەر حەیا مەسەلەیەکی پرسی. شێخ جوابی ئەو مەسەلەی داوە. دەروێش بوو بە ئاو. مریدێک وە ژوور کەوت، ئاوێکی بینی زەرد وەستاوە. کوتی " یا شێخ ئەمە چیە؟ "

کوتی " یەکێک لە دەرگا وە ژوور کەوت و پرسیارێکی لە حەیا کرد و من جوانم داوە. بەرگەی نەگرت. ئاوا بوو بە ئاو لە شەرمان. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

ئەحمەدی خەزروویە کوتی:

ڕۆژێک چوومە لای شێخ ئاوێکم بینی لە پێش شێخ دەلەراوە. لە شێخم پرسی، کوتی "کەسێک وە ژوور کەوت و لە عیلم و حەیا شتێکی پرسی. باسم کرد، تواوە و بوو بەو ئاوە کە دەیبینی. "

ئەحمەد کوتی " ئەو ئاوەم هەڵگرتەوە ڕەق بوو. کردمە نقیمێک. هەرکات باسی ئەو تایفەیان کردبا، ئەو نەقیمە دەلەراوە. " (ل ٣٤٥)

٤٥. **دەگێڕنەوە کە:**

کوتی " جارێک گەیشتمە **دیجلە**. **دیجلە** ئاوەکەی لێک کێشاوە. کوتم: بەمە غەرڕە نابم کە بە نیو دانگ دەمپەڕێننەوە. من سی ساڵ عومری خۆم بە نیو دانگ بە زیان نادەم. من کەریمم دەوێ نەک کەرامەت. "

٤٦. **دەگێڕنەوە کە:**

شێخ لە پشت سەری ئیمامێک نوێژی دەکرد. پاشان ئیمام کوتی " یا شێخ! تۆ کاسبی ناکەی و لە کەس شتێک وەرناگری. لە کوێی دێنی و دەخۆی؟"

شێخ کوتی " بوەستە هەتا نوێژی قەزا بکەم، کە نوێژ لە پشت سەری کەسێک کە ڕۆژییدەر نەناسێ، ڕەوا نییە. "

٤٧.

جارێک کەسێکی لە مزگەوت بینی کە خەریکی نوێژە، کوتی " ئەگەر پێتوایە کە نوێژ دەبێتە هۆی گەیشتن بە خودا غەڵەت دەکەی، کە هەمووی گومانە نەک وەسڵ. ئەگەر نوێژ نەکەی کافر دەبی و ئەگەر زەڕڕەیەک بە چاوی متمانە سەیری بکەی، دەبیە موشریک. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

بایەزید پیاوێکی بینی کە لە مزگەوتی وی نوێژ دەکا، کوتی " ئەگەر پێتوایە ئەو نوێژەی تۆ وەسڵ بوون و پێوەلکانە وەها نییە کە ئەمە هەڵبڕانە. ئەگەر ئەو تەرک بکەی کافر دەبی و ئەگەر خۆ بە موشاهیدەی بخافڵێنی، شیرکت کردووە. " (ل ١٩٧)



٤٨. **دەگێڕنەوە کە:**

کوتی " کەس هەیە کە دێتە زیارەتی ئێمە و بەرهەمەکەی لەعنەتە و کەس هەیە کە دێ و فایدەکەی ڕەحمەتە. "

کوتیان " چلۆن؟ "

کوتی " یەکێک بێ کە دەو حاڵەتە دا دەگەڵ خۆم نەبم، غەیبەتم دەکا و تووشی لەعنەت دەبێ. ئەوی دیکە دێ هەق بە سەر من دا زاڵ دەبینێ، لێمدەبووریێ. بەرهەمەکەی ڕەحمەت دەبێ. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتی " پیاو هەیە کە دێتە زیارەتی من و بەرهەمی هاتنەکەی لەعنەت دەبێ و ئەوەی دیکە فایدەکەی ڕەحمەت دەبێ. "

کوتیان " چلۆن دەبێ؟ "

کوتی " ئەوەکە یەکێک من زیارەت بکا حاڵەتێک بە سەرم دا زاڵ بێ و ئەو ئاگاداری ئەوە نییە هەر ئەوجۆرەی کە خووی خەڵک داخوازیەتی غەیبەتم دەکا و تووشی لەعنەت دەبێ. ئەوی دیکە دێ هەق بە سەر من دا زاڵ دەبینێ، هەتاوی مەعرەفەت لە سینگی دەدا، من مەعزوور دەکا و دەگەڕێتەوە. ئەو زیارەتە دەبێتە هۆی ڕەحمەت. " (ل ٣٥٧)

٤٩.

کوتی " دەمەوێ کە زووتر قیامەت داهاتبا هەتا من خێوەتی خۆم لە پەنا دۆزەخ هەڵدابا، کە چون دۆزەخ من ببینێ، تەخت بێ. هەتا من ببمە هۆی ڕاحەتیی خەڵک. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتی " دەمەوێ کە ڕۆژی قیامەت هەستمەوە و خێوەت لە لێواری دۆزەخ هەڵبدەم. "

کوتیان " بۆچی؟ "

کوتی " چونکە دەزانم کە دۆزەخ من ببینێ دادەمرکێ جا من دەبمە هۆی ڕەحمەت و ڕاحەتی خەڵک. " (ل ٣٥٨)

٥٠.

**حاتەمی ئەسەم** بە مریدەکانی کوت " هەرکام لە ئێوە ڕۆژی قیامەت شەفیعی ئەهلی دۆزەخ نەبێ، ئەوکەسە مریدی من نییە. "

ئەم قسەیان بە **بایەزید** کوت. **بایەزید** کوتی " من دەڵێم کە مریدی من ئەوکەسەیە کە لە پەنا دۆزەخ بوەستێ و هەرکەس کە ببەنە دۆزەخ، دەستی بگرێ و بیباتە بەهەشت و لەبری ئەو خۆی بچێتە دۆزەخ. "

٥١.

گەورەیەک چوو لای **بایەزید**. بینی دە نێو خۆی دا نوقمی بیر و فکرە. کە سەری هەڵێناوە، کوتی " ئەی شێخ! چت کرد؟"

کوتی " سەرم بردە نێو فەنای خۆمەوە و لە بەقای هەق دەرمکێشاوە. "

٥٢.

مریدێک شێخی بینی دەلەرزێ.

کوتی " یا شێخ! ئەو جووڵەیەت هی چیە؟ "

شێخ کوتی " سی ساڵ دەبێ ڕێگەی ڕاستیی ببڕی و خۆڵی کەلاوان بە ردێنت بماڵی و سەر لە سەر ئەژنۆی خەفەت بنێی هەتا لە جووڵەی



پیاوان بگەی. بە یەک دوو ڕۆژ کە لە پشت تەختە هەستاوی، دەتەوێ کە لە سیرڕی پیاوان بگەی؟ "

**٥٣. دەگێڕنەوە کە:**

ڕۆژێک خەتیب لە سەر مەنبەر ئەو ئایەی خوێندەوە " و ما قدر و الله حق قدره "

هێندەی سەر لە مەنبەر کوتا هەتا بێهۆش بوو.

پاشان کوتی " چۆنت زانی. ئەم کەززابی درۆزنە بۆ کوێ دێنی هەتا داوای مەعرەفەتی تۆ بکا؟ "

٥٤.

کوتیان " بەو فەزلەی کە هەق تەعالا پێیکردووی، بۆچ بانگەوازی خەڵک بۆ خودا ناکەی؟ "

کوتی " کەسێک کە ئەو بەندی کردبێ، **بایەزید** چلۆن دەتوانێ کە لایبا."

**٥٥. دەگێڕنەوە کە:**

پیاوێک هاتە لای شێخ و شێخ دە خۆی دابوو. کە سەری هەڵبڕی پیاوەکە کوتی " لە کوێ بووی؟ "

کوتی " لای حەزرەت! "

پیاوەکە کوتی " من هەرئێستا لای حەزرەت بووم و تۆم نەبینی. "

کوتی " ڕاست دەکەی کە من دە ئەندەروونی پەردە دابووم و تۆ لە دەر. هی دەران، ئەندەروونییان نابینن. "

٥٦.

کوتی " هەرکەس قورئان بخوێنێ و نەچیتە سەر مەیتی موسڵمانان و سەری نەخۆشان نەدا و حاڵی هەتیوان نەپرسێ و داوای ئەو حەدیسە بکا، بزانن کە مودەعییە. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا دوای ئەو ڕەوایەتە هاتووە کە:

بایەزید لە سەر جەنازە حازر نەدەبوو و سەری نەخۆشانی نەدەدا و نەدەچوو سەرەخۆشی. لەم بارەوە پێیانکوت کە " پێشتر ساڵحانی ئوممەت دەچوونە سەردانی نەخۆش و لە سەر جەنازە حازر دەبوون و دەچوونە سەرەخۆشی؟ "

بایەزید لە وڵام دا کوتی " ئەوان هەرچیان کرد لەبەر ئەقڵێک بوو و کاری پیرێکی وەک منیش لە بێ ئەقڵی نییە. " (ل ٢٠٥)

٥٧.

یەکێک بە شێخی کوت " دڵ ساف بکە هەتا قسەیەکت پێبڵێم. "

کوتی " سی ساڵە لە هەق داوای دڵێکی ساف دەکەم، هێشتا دەستم نەکەوتووە. سەعاتێک دڵی ساف بۆ تۆ لە کوێ بێنم. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

یەک لە مەشایخ بە بایەزیدی کوت " سەعاتێک دڵی خۆت دەگەڵ من سەفا بدە هەتا قسەیەکت پێبڵێم. "

بایەزید وڵامی داوە کە " سی ساڵە هەر ئەوەم دەوێ کە سەعاتێک دڵی خۆم دەگەڵ خودا ساف بکەم و ئەم دڵە هێشتا پاک نەبۆتەوە چۆن دەتوانم بۆ تۆ یەک سەعات پاکی بکەمەوە؟ " (ل ٢٣١)

هەروەتر ئەو ڕەوایەتە بە هەندێک جیاوازییەوە بە ناوی جونەیدیش هاتووە هەم دە کتێبی کشف المحجوب دا (ل ٣٧١) و هەم دە تەزکەرەی ئەولیا دا:



ڕۆژێک کەسێک هاتە لای جونەید و کوتی " سەعاتێک حازر بە هەتا قسەیەک بڵێم. "

جونەید کوتی " ئەی عەزیز! تۆ شتێک لە من تەڵەب دەکەی کە دەمێکە من تەڵەبی دەکەم و دەمەوێ یەک نەفەس دەگەڵ هەقتەعالا حازر بم، نەمتوانیوە. ئەو ساعەتە بۆ تۆ کوا دەتوانم حازر بم؟ " (ل ٤٢٤)

٥٨.

کوتی " خەڵک پێیانوایە ڕێگەی بەرەو خودای تەعالا ڕووناکترە لە هەتاو و من چەندین ساڵە داوای لێدەکەم بە قەرا سەرە دەرزییەک لەم ڕێگەیەم بۆ بکرێتەوە و ناکرێتەوە. "

٥٩. دەگێڕنەوە کە:

ئەگەر ڕۆژێک بەڵایەکی پێنەگەیبا، دەیکوت " خودایە! نانت نارد، پێخۆری پێویستە، بەڵایەک بنێرە بیکەمە پێخۆر. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

هەر ڕۆژێک کە بایەزید وەجدێکی نەبا و بەڵایەکی پێنەگەیشتبا و دژوارییەکی نەدەبینی نەدای لە پەروەردگاری خۆی دەکرد کە " خودایا! ئەوڕۆ نانی منت نارد و بەڵایەکت بۆ من نەنارد هەتا بیکەمە پێخۆر. " (ل ١١٣)

هەروەها دە کتێبی تفسیر کشف الاسرار دا وەها هاتووە:

بایەزیدی بەستامیی ئەگەر ڕۆژێک بەڵایەکی پێنەگیشتبا دەیکوت "خودایە! چێشتی بێ خۆریشت چۆن بخۆم؟ " (ب ١ ل ٤٥١)

٦٠.

ڕۆژێک **بوو مووسا** لە شێخی پرسی " بەیانیت چۆنە؟ "

کوتی " بۆ من نە بەیانانە هەیە و نە شەوانە. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

ئەبوومووسا کوتی بە بایەزیدم کوت " شەوت چۆن کردە ڕۆژ؟ "

کوتی " لەو جێگەی کە منم، شەو و ڕۆژ نییە. شەو و ڕۆژ هی کەسێکە کە گرفتاری سفەتەکان بێ و من سفەتێکم نییە. " (ل ١٥٣)

٦١. **کوتی:**

لە سینگمەوە دەنگێک هات کە " ئەی **بایەزید!** خەزێنەکانی ئێمە لە تاعەتی قەبووڵکراو و خزمەتی پەسندکراو پڕن، ئەگەر ئێمەت دەوێ شتێکمان بۆ بێنە کە نەمانبێ. "

کوتم " خودایە! ئەوە چیە کە تۆ نەتبێ؟ "

کوتی " بێچارەیی و عەجز و نیاز و زەلیلیی و بێ ئەنوایی و تێشکاویی!"

--------------------

دە کتێبی تفسیر کشف الاسرار دا وەها هاتووە:

بوویەزیدی بەستامیی دە خەو دا بیستی کە لە مەقامی سەدری تەریقەتەوە پێیدەڵێن " لە دەرگای ئێمە رکووع و سجوود بێ دڵی شکاو و بێ سەفای گیان بە کار نایە، کە خەزێنەکانی عیززەتی ئێمە پڕ لە رکووع و سوجوودی خاوەنانی دڵە. کاتێک دێیە بەر دەرگای ئێمە دەردی دڵ لە سەر جامی گیان دانێ و بۆ حەزرەتی جانانی بنێرە کە دەردی دڵ لای ئێمە پلە و پایەیەکی هەیە. (ب ١ ل ٥٠٥)



٦٢.

کوتی " چوومە سەحرا. ئەشق بارییبوو و زەوی تەڕ، وەها کە پێی پیاو دە قوڕ رۆچێ، لە ئەشق رۆچووم. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

بایەزید کوتی " چوومە سەحرا بینیم ئەشق بارییبوو، وەها کە پێ دە بەفرەوە رۆدەچێ، پێی من دە ئەشقەوە رۆدەچوو. (ل ٣٠٩)

٦٣.

کوتی " لە نوێژ جگە لە وەستاویی لەشم نەبینی و لە ڕۆژوو جگە لە برسیایەتی زگ. ئەوەی کە بۆ منە لە فەزلی ئەوە، نەک لە فێعلی من."

٦٤. **هەروەتر:**

کوتی " بە هەوڵ و کەسب هیچ پێکنایە و ئەم حەدیسەی من بەر لە هەر دوو کەونە، بەڵام بەندەی بەختەوەر ئەوکەسەیە کە دەڕوا لەنەکاو پێی دە گەنجێک رۆچێ و دەوڵەمەند بێ. "

٦٥. **هەروەتر:**

کوتی " هەر مریدێک کە ئیرادەت دێنێ، من دەبێ دابەزمە خوارتر و بە قەرا فامی ئەو قسە بکەم. "

**٦٦. دەگێڕنەوە کە:**

کاتێک باسی سفاتی هەقی دەکرد، شادمان و ساکین بوو و کاتێک باسی زاتی دەکرد، لە جێ ڕادەپەڕی و وە جووڵە دەکەوت و دەیکوت " هات هات و بە سەر هات "

٦٧.

شێخ پیاوێکی بینی کە دەیکوت " پێم سەیرە ئەوکەسەی کە ئەو دەناسێ و تاعەتی ناکا. "

شێخ کوتی " پێم سەیرە ئەوکەسەی کە ئەو دەناسێ و تاعەتی دەکا."

یانی: سەیرە ئەگەر لە سەر قەرار بمێنێتەوە.

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

بایەزید لە پیاوێکی بیست کە دەیکوت " پێم سەیرە کەسێک کە خودا دەناسێ و سەرکێشیی دەکا. "

بایەزید کوتی " پێم سەیرە کەسێک کە خودا دەناسێ و چلۆن ئەو عیبادەت دەکا. " (ل ١٨٢)

**٦٨. هەروەتر لە ئیستغراق دا وەها بوو کە:**

بیست ساڵ بوو مریدێکی هەبوو کە لێی جوێ نەبۆوە.

ڕۆژێک بە شێخی کوت " مەگەر گەمەم پێدەکەی! بیست ساڵە لە خزمەتی تۆ دام و هەموو ڕۆژێ ناوم دەپرسی؟ "

شێخ کوتی " ئای لاوچاک! گاڵتەی ناکەم بەڵام ناوی ئەو هاتووە و گشت ناوەکانی لە دڵم بردووە. ناوی تۆ فێر دەبم و دیسان فەرامۆشی دەکەمەوە."



**٦٩. دەگێڕنەوە کە:**

لێیانپرسی " ئەم دەرجەیەت بە چی دەست کەوت و چلۆن بەم پلەیە گەیشتی؟ "

کوتی " شەوێک بە منداڵیی لە بەستام دەرکەوتم. مانگەشەو بوو و دونیا خەوتوو. حەزرەتێکم بینی کە هەژدە هەزار عالەم لە لای ئەو حەزرەتە زەڕڕەیەک دیاری دەدا. شەوقێکم تێکەوت و حاڵەتێکی گەورەم بە سەر دا زاڵ بوو. کوتم: خوایە! دەرگایەکی بەو مەزنییە و وەها خاڵی؟ کارگایەک بەم سەیرییە و وەها شاراوە؟

دوای ئەوە هاتفێک دەنگی هات کە: دەرگای خاڵی لەبەر ئەوە نییە کە کەس نایە، لەبەر ئەوەیە کە ئێمە نامانەوێ. هەر ڕوونەشۆراوێک شایەنی ئەو دەرگایە نییە.

نییەتم کرد کە [شەفاعەتی] گشت مەخلووق بکەم. دیسان بیرم کردەوە کە: مەقامی شەفاعەت هی مەحەممەدە، ئەدەبم ڕاگرت. خیتابێکم بیست کە: بەم یەک ئەدەبە کە ڕاتگرت، ناوتمان بەرز کردەوە وەها کە هەتا قیامەت بڵێن: سوڵتانەلعارەفین **بایەزید**! "

--------------------

دە کتێبی تفسیر کشف الاسرار دا وەها هاتووە:

بایەزیدی بەستامیی، شەوێک لە مناجات دابوو. جەهانێکی بینی حەساوە، مانگەشەوێک و ئەستێرەکان درەوشاوە، بێدەنگییەکی تەواوە. نە دەنگ و ئاوازێک، نە ڕاز و نیازێک، بە خۆی کوت " مخابن! دەرگایەکی وەها گەورە و وەها بەتاڵ! "

لە غەیبەوە نەدایەکی بیست " ئەی بایەزید! تۆ پێتوایە بەتاڵە! پەردە لە گوێت هەڵدەگرن گوێ بگرە ناڵەی سووتاوان و لێقەوماوان دەبیسی. "

بایەزید کوتی " چوارگۆشەی جەهانیان لە پێش من دانا، لە هەر گۆشەیەک ناڵەیەکم بیست و لە هەر سووچێک سۆز و نیازێک و لە هەر لایەک دەرد و زامێک. بایەزید خۆی

له ئاست وان ناچیز بینی، دلۆپێک ده دەریایەک دا و یا زەڕڕەیەک له هەوایەک دا. زمانی حەیرەت و حەسرەتی کردەوە و کوتی: خودایا! ده دەریای شەوقی تۆ دا گەلێک خنکاو هەن و له بیابانی ئیرادەتی تۆ دا گەلێک حەیرانن. له بەر دەرگای جەلالی تۆ گەلێک کوژراو هەن و له سەر هیوای ویسالی تۆ گەلێک دلّدار! نه هیچ تالبێک ئارامه و نه هیچ قاسیدێک دەگاته کام و ئاکام. " (ب ٢ ل ٥٨٢)

**٧٠. دەگێڕنەوە کە:**

کوتی " له هەموو عومری خۆم دا دەبا نوێژێکم کردبا که شایەنی حەزرەت با و پێمنەکرا. شەوێک له نوێژی خەوتنانەوە هەتا بەیانی چوار رەکەعەت نوێژم دەکرد و هەرجارەی تەواو دەبووم، دەمکوت: لەوە باشتر دەبێ بیکەم. هێندەی نەمابوو بەیانی دابێ و هەر پێمنەکرا. کوتم: خودایە! من هەولّم دا که شایەنی تۆ بێ، بەلاّم نەبوو، شایەنی **بایەزیدە**. ئێستا تۆ بێ نوێژت زۆرن، **بایەزیدیش** به یەک لەوان دابنێ. "

**٧١. کوتی:**

دوای ریازەتی چل سالّه شەوێک حیجابی هەلّگرت. پاڕامەوە هەتا ڕێم بدەن. خیتاب هات که " به گۆزەیەکی که تۆ هەتە و کەوڵێک، تۆ بار نادەین. "

گۆزە و کەولّم فڕێ دا.

نەدایەکم بیست که " یا **بایەزید!** بەم مودەعیانە بلّێ کە: **بایەزید** دوای چل سالّ موجاهیدە و ریازەت به گۆزەیەکی شکاو و کەولّێکی شڕ و دڕاو، هەتا فڕێی نەدا بارمان نەدا. ئێوە بەو هەموو عەلایقە کە لە خۆتان بەستووە و تەریقەتتان کردۆتە چێشکەی داوی هەوای نەفس، حاشا کە هەرگیز ڕێتان نادەین. "



**٧٢. دەگێڕنەوە کە:**

شەوێک له سەر پەنجەی پێیان وەستا، له نوێژی خەوتنان هەتا بەرەبەیان. خادم ئەو حالّەی دەبینی و خوێن له چاوەکانی شێخ دەتکا سەر خاک. سەری سوڕما. بەیانی له شێخی پرسی که " ئەوە چ حالّێک بوو؟ نەسیبێکیش بدە بە ئێمە. "

شێخ کوتی " یەکەم هەنگاو گەیشتمە عەرش. عەرشم بینی وەک گورگێکی لمبۆز پیسی ورگ بەتالّ. کوتم: ئەی عەرش بەرەو تۆمان بەڕێ دەکەن کە: الرحمن علی العرش استوی. وەرە بزانین چت پێیە؟ عەرش کوتی: چ جێی ئەو حەدیسەیە کە دلّی تۆش بە ئێمە نیشان دەدەن کە: انا عند المکسرە قلوبهم. ئەگەر ئاسمانیین هی زەمینیان دەوێ و ئەگەر زەمینیین هی ئاسمانیانیان دەوێ و ئەگەر پیرە لە جەوان داوا دەکا و ئەگەر جەوانە لە پیری دەوێ، ئەگەریش زاهیدە لە خەراباتیی دەگەڕێ و ئەگەر خەراباتییە لە زاهیدی دەوێ.

کە گەیشتمە مەقامی قورب، کوتیان: بخوازە! کوتم: من داوایەکم نییە، هەر خۆشت بۆم بخوازە. کوتم: تۆم دەوێ و بەس. کوتیان: هەر زەڕڕەیەک لە وجوودی **بایەزید** باقی بێ، ئەم داوایە مەحالّە. **دع نفسک و تعال**. کوتم: ناتوانم دەسبەتالّ بگەڕێمەوە، دەمەوێ گوستاخییەک بکەم. کوتیان: بیلّێ. کوتم: ڕەحمەت بە هەموو خەلّک بکە! کوتیان: ئاوڕ بدەوە! ئاوڕم داوە هیچ خولّقاوێکم نەبینی ئیللا کە ئەو شەفیعێک بوو و هەقم بۆ وانم زۆر لە خۆم دلاّواتر بینی. هەربۆیە بێدەنگ بووم. دوایە کوتم: ڕەحمەت بە ئیبلیس بکە. کوتیان: گوستاخییت کرد، بێدەنگ! کە ئەو لە ئاگرە. لە ئاگر بۆ ئاگر دەبێ تۆ هەولّی ئەوە بدە کە خۆت تووشی سزای ئاگر نەیەی کە تاقەت ناهێنی. "

**٧٣. دەگێڕنەوە کە:**

کوتی " هەق دوازدە هەزار مەقامی لە کن خۆی بۆ حازر کردم و لە هەر مەقامێک مەملەکەتێکی پێشکەش کردم، من قەبووڵم نەکرد. لە ئاکام پێیکوتم: ئەی **بایەزید!** چت دەوێ؟ کوتم: ئەوە کە هیچم نەوێ! "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

بیابانەکانم بڕی هەتا گەیشتمە مەیدانەکان و مەیدانەکانم بڕی هەتا گەیشتمە مەلەکووت و مەلەکووتم بڕی هەتا گەیشتمە هەق. کوتی " ئەوەی بینیت هەمووم بە تۆ بەخشی. "

کوتم " تۆ دەزانی کە من لەو هەموویە هیچم نەبینی. "

کوتی " چت دەوێ؟ "

کوتم " ئەوەم دەوێ کە نەمەوێ. "

کوتی " ئەوەم پێبەخشی. " (ل ٢٤٩)

هەروەتر دە کتێبی تفسیر کشف الاسرار دا وەها هاتووە:

بایەزیدی بەستامیی کوتی:

خوداوەند لە پێشگای خۆی هەزار فریشتەی پێشکەش کردم. کوتم " ئەوەم نەویستووە."

نەدا هات کە " چت دەوێ؟ "

کوتم " دەمەوێ کە هیچم نەوێ. " یانی تەنیا تۆم دەوێ.

نەدا هات کە " تۆ بەندەی شیاوی منی. " (ب ١ ل ١٣٨)

هەروەتر هەر دەو کتێبە دا دیسان وەها هاتووە:

بایەزیدی بەستامیی کوتی:

خودا لە چەند وێستگە منی ڕاگرت، لە هەموو جێ وڵاتەکانی بە من نیشان دا، کوتم "نامەوێ! "

لە وێستگەی ئاخر پرسی " ئەدی چت دەوێ؟ "

کوتم " دەمەوێ کە هیچم نەوێ! "

خودا فەرمووی " بە هەق کە تۆ بەندەی منی! " (ب ٢ ل ٣٤٦)



**٧٤. هەروەتر:**

کاتێک کەسێک داوای دوعای لێکردبا، دەیکوت " خودایە! خەڵکی تۆن و تۆ خالقی وانی. من لەو نێوە دا کێم کە لە نێوان تۆ و خەڵکی تۆ واسیتە بم؟ " جا بە خۆی دەکوت " ئەو زانای ئەسرارە، من چم بەو فزوولییە داوە. "

**٧٥. هەروەتر:**

یەکێک هاتە لای شێخ و کوتی " شتێکم فێر بکە کە ببێتە هۆی ڕزگارییم."

کوتی " دوو قسە فێر بە! لە عیلم ئەوەندەت بەس کە بزانی هەق ئاگای لە تۆیە و هەرچی دەیکەی دەیبینێ. ئەوەش بزانە کە خودا لە عەمەلی تۆ بێنیازە. "

**٧٦. هەروەتر:**

ڕۆژێک شێخ دەڕۆیشت. لاوێک پێی لە سەر جێ پێی دادەنا و دەیکوت "وەها هەنگاو لە سەر هەنگاوی شێخ دادەنێن. " کەوڵێک بە سەر شانی شێخەوە بوو و کوتی " یا شێخ! کوتێک لەو کەوڵەمان بدەیە هەتا لە بەرەکاتی تۆ شتێکمان پێبگا."

شێخ کوتی " ئەگەر کەوڵی **بایەزید** بە خۆ دادەی کەلکێکی نابێ هەتا عەمەلی **بایەزید** نەکەی. "

**٧٧.   هەروەتر:**

ڕۆژێک حاڵشێواوێکی بینی کە دەیکوت " خودایە! سەیرێکم بکە! "

شیخ  لە تاو غەیرەت و غەڵەبەی وەجد کوتی کە " هێندە سەر و ڕوویەکی جوانت پێوەیە هەتا سەیرت بکا؟ "

کوتی " ئەی شێخ! ئەو نەزەرەم بۆیە دەوێ هەتا سەر و ڕووم جوان بێ."

شێخ زۆری پێخۆش بوو. کوتی " ڕاست دەکەی. "

٧٨.   دەگێڕنەوە کە:

شێخ ڕۆژێک لە سەر هەقیقەت دەدوا و لێوی خۆی دەمژی و دەیکوت "هەم شەرابم و هەم شەرابخۆر و هەمیش ساقی."

**٧٩.   دەگێڕنەوە کە:**

کوتی " حەفتا زوننارم لە قەد کردەوە، یەکێک ما. هەرچی هەوڵم دا نەدەکراوە. گریام و کوتم: خودایە! قەوەتم بدەیە هەتا ئەوەش بکەمەوە. دەنگێک هات کە: هەموو زوننارەکانت کردەوە، کردنەوەی ئەو یەکە کاری تۆ نییە. و کوتی: بە هەموو دەستێک لە دەرگام کوتا، هەتا بە دەستی بەڵا نەمکوتا نەیانکردەوە. بە هەموو زمانەکان بارم خواست، هەتا بە زمانی خەفەت داوام نەکرد باریان نەدا و بە هەموو هەنگاوێک بە ڕێگاکەی دا ڕۆیشتم، هەتا بە هەنگاوی دڵ نەچووم نەگەیشتمە مەنزڵگەی عیززەت. "



**٨٠.  هەروەتر:**

کوتی " سی ساڵ بوو هەر دەمکوت: وەها بکە و وەها بدە! کە گەیشتمە یەکەم هەنگاوی مەعرەففەت کوتم: خودایە! تۆ هی من بە و هەرچی دەکەی بیکە. "

**٨١.   هەروەتر:**

کوتی " جارێکان ڕوو لە دەرگای ئەو موناجاتم کرد و کوتم: **کیف السلوک الیک؟** (هاتن بەرەو تۆ چۆنە؟)

نەدایەکم بیست کە: ئەی **بایەزید! طلق نفسک ثلثا، ثم قل: الله** - دە پێشدا خۆت سێ تەڵاق بدە لە دوایی حەدیسی ئێمە بکە."

**٨٢.   هەروەتر:**

کوتی " سی ساڵ خودام عیبادەت کرد. کە خامۆش بووم، ڕوانیم حیجابی من زیکر بوو. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

بایەزید کوتی " سی ساڵ یادی خودام کرد، پاشان خامۆشییم هەڵبژارد، جا زانیم کە حیجابی من هەمان یاد بوو. " (ل ١٧٥)

هەروەتر لە لاپەڕەی ٢٦٣ی هەر ئەو کتێبە دا و لاپەڕەی ١١٩ شرح شطحیات دا هاتووە:

بایەزید کوتی " سی ساڵ لە هەقتەعالا غایب بووم. غەیبەتی من لەو زیکری وی بوو، کاتێک لەو کارە دەستم هەڵگرت، ئەوم هەمیشە وەها بینی کە گۆیا ئەو منم. "

**٨٣ هەروەتر:**

کوتی " ئەگەر هەقتەعالا حیسابی حەفتا ساڵەی بوێ، من حیسابی حەفتاهەزار ساڵم دەوێ، لەبەر ئەوەیکە حەفتاهەزار ساڵە **الست بربکم** - ی کوتووە و هەمووی وە شەوق هێناون لەبەر بەڵێ کوتن. گشت شۆقی زەوی و ئاسمان لە شەوقی ئەلەستە. "

پاشان کوتی " دوای ئەوە دەنگێک هات کە: جواب بییسە. ڕۆژژمێری حەوت ئەندامت زەڕڕە زەڕڕە دەکەین و بە هەر زەڕڕەیەک دیدار دەدەین. ئەوەت حیسابی حەفتاهەزار ساڵ و حاسڵ و باقی لە پەناتی دادەنێین. "

**٨٤ هەروەتر:**

کوتی " ئەگەر هەشت بەهەشت دە خانووچکەی من دا بکەنەوە و ویلایەتی هەردوو سەرام پێببەخشن دیسان بەو ئاخەی بەرەبەیانانی نادەم کە بە یادی شەوقی ئەو لە گیانی من دێتە دەر. "

**٨٥ هەروەتر:**

کوتی " ئەو ویستی کە من ببینێ و من نەمویست کە ئەو ببینم. " - یانی بەندە ویستی نییە.

**٨٦ هەروەتر:**

کوتی " چل ساڵ ڕووم لە خەڵک کرد و ئەوانم بەرەو هەق بانگەواز کرد و کەس قەبووڵی نەکرد. ڕووم لەوان وەرگێڕا و چوومە لای حەزرەت. هەمووم بەر لە خۆم لەوێ بینی. " یانی عینایەتی هەقم لە هەق خەڵک دا پتر لە عینایەتی خۆم بینی.



**٨٧ هەروەتر:**

کوتی " لە **بایەزیدیی** هاتمە دەر، وەک مار لە توێژ. کە سەیرم کرد: ئاشق و مەعشووقم بە یەک بینی کە لە عالەمی تەوحید هەر یەک دەتوانی ببینی. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

لە خۆیی خۆم هاتمە دەر، وەک مار لە توێژی خۆی؛ ئەوسا ڕوانیمە خۆم، دیتم کە من ئەوم. (ل ١٦٨)

**٨٨ هەروەتر:**

کوتی " لە منەوە نەدایان کردە من کە: ئەی تۆ، من " -یانی گەیشتمە مەقامی الفناء فی الله

**٨٩ هەروەتر:**

کوتی " چەند هەزار مەقامم لە پشت سەر نا، کە ڕوانیم خۆم لە مەقامی حەرفی ئەڵڵا بینی. " یانی ڕێگە بۆ مانای ئەڵڵا، کە نەهایەتە، نییە.

**٩٠. هەروەتر:**

کوتی " هەقتەعالا سی ساڵ ئاوێنەی من بوو. نووکە من ئاوێنەی خۆمم. " یانی ئەوەیکە من بووم، نەمام. چونکە من و هەق شیرکە. کە من نەمام، هەقتەعالا ئاوێنەی خۆیەتی. ئەوەیکە من دەڵێم کە " ئاوێنەی خۆمم، هەقە کە بە زمانی من قسان دەکا و من دەو نێوە دا نەماوم. "

--------------------

دە کتێبی شرح شطحیات دا وەها هاتووە:

بایەزید دەڵێ " ئیلاهی تۆ بوویە ئاوێنە بۆ من و من بوومە ئاوێنە بۆ تۆ. " (ل ١٠٥)

هەروەتر دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا هاتووە:

ماوەیەک تۆ ئاوێنەی من بووی، ئێستا من ئاوێنەم. " (ل ١٧١)

**٩١. هەروەتر:**

کوتی " چوومە بەر دەرگای عیززەت. هیچ قەرەباڵغ نەبوو. ئەهلی دونیا خەریکی دونیا بوون و مەحجووب. ئەهلی ئاخیرەت خەریکی ئاخیرەت، ئەربابی تەریقەت و تەسەووف خەریکی خواردن و خواردنەوە و قەومێک خەریکی سەماع و سەما و ئەوانەی کە پێشرەوانی ڕێگە بوون و پێشەنگی سپا لە بادیەی حەیرەت ون ببوون و دە دەریای عەجز دا نوقم بوون. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتی " بە بەر دەرگای عیززەت دا تێپەڕیم خەڵکێکی وەهای لێنەبوو، چونکە ئەهلی دونیا دە حیجابی دونیا دا بوون و ئەهلی ئاخیرەت خەریک بە ئاخیرەت و ئیدعاکەرانی تەسەووف دە حیجابی خواردن و خواردنەوە و گەدایی و ئەوانەی کە سەرتریش بوون دە حیجابی سەماع و شاهید دا. پێشەوایانی تەسەووف کە هیچ شتێک لەو شتانەیان حیجاب نییە، ئەوانم سەرگەردان و مەست بینی. " (ل ١٦٥)

**٩٢. هەروەتر:**

کوتی " ماوەیەک بە دەوری ماڵ دا تەوافم دەکرد، کاتێک گەیشتمە هەق، ماڵم بینی کە بە دەور من دا تەواف دەکا. "

**٩٣. کوتی:**

شەوێک لە دڵی خۆم دەگەڕام، نەمدیتەوە.

بەرەبەیان نەدایەم بیست کە " ئەی **بایەزید!** جگە لە ئێمە لە شتی دیکە دەگەڕێی؟ تۆ کارت بە دڵ چیە؟ "



**٩٤. هەروەتر:**

کوتی " پیاو ئەوە نییە کە بە شوێن شتێک دا بڕوا. پیاو ئەوەیە کە لە هەرکوێیەک بێ، هەرچی کە بخوازێ بێتە لای ئەو و دەگەڵ هەرکەس قسان بکا، لەو جواب ببیسێ. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

مەردی مەردستان ئەوەیە کە دانیشتووە و ئەشیا دێنە دیداری و هەروا دانیشتووە و ئەشیا لە هەرکوێیەک کە هەن دەگەڵ ئەو قسە دەکەن. (ل ١٧١)

**٩٥. هەروەتر:**

کوتی " هەقتەعالا منی گەیاندە ڕادەیەک کە گشت خەڵکم لە نێوان دوو ئەنگوستی خۆم دا بینی.

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتی و بیستم کە دەیکوت " منی دەگەڵ خۆی بردە جێگایەک کە هەموو خەڵکی لە نێوان دوو ئەنگوستی من، بە من نیشان دا. " (ل ١٧١)

**٩٦. هەروەتر:**

کوتی " شیرینایی تاعەت دەدەن بە مرید، ئەگەر پێی دڵخۆش بێ، شادیی ئەو دەبێتە حیجابی قوربی ئەو. "

**٩٧. هەروەتر:**

کوتی " کەمترین دەرەجەی عارف ئەوەیە کە سفاتی هەقی تێدابێ. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کەمترین سفەت لە سفەتەکانی عارف ئەمەیە کە سفەتەکانی هەق و جنسی ڕەببایەتی دەو دا وەگەڕ بکەوێ. " (ل ١٧٢)

**٩٨. هەروەتر:**

کوتی " ئەگەر لەبری خەڵک من بە ئاگر بسووتێنن و من سەبر بکەم، هیچم نەکردووە چونکە من ئیدعای مەحەببەتی وی دەکەم. هەروەتر ئەگەر گوناهی من و هەموو خەڵک ببەخشێ، هێشتا کارێکی ئەوتۆ نییە، چونکە سفەتی ڕەحمەت و شەفەقەت هی ئەوە. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتی " پێمخۆش دەبوو ئەگەر خودای تەعالا هەموو دونیا بکاتە پاروویەک و بیدا بە من هەتا دە زاری سەگێکی بنێم هەتا خەڵک فریوی دونیا نەخۆن و ئەگەر من لەبری هەموو خەڵک  بە ئاگری دۆزەخ عەزاب بدەن، بەو ئیدعایەی کە من لە مەحەببەتی ئەو دەیکەم، کارێکی گەورە نییە و ئەگەر هەموویان ببەخشێ لەو کارێکی گەورە نییە کە دەڵێ: من بۆ خەڵک دڵاوا و مێهرەبانم. " (ل ١٧٢)

**٩٩. هەروەتر:**

کوتی " تۆبە لە گوناهـ یەکە و لە تاعەت هەزار " – یانی خۆخوازیی دە تاعەت دا خرابترە لە گوناهـ

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا هەروەتر هاتووە:

کوتی " دە تاعەتەکان دا ئافەتێک شاراوەیە کە نیازێک بۆ گەڕان لە گوناهـ نییە. " (ل ١٨٥)



**١٠٠. هەروەتر:**

کوتی " کەمالی دەرەجەی عارف سووتانی ئەوە دە مەحەببەت دا. "

**١٠١. هەروەتر:**

کوتی " خودا بەندەی وای هەیە کە ئەگەر بەهەشت بە هەموو ڕازاوەیی پێشکەشی وان بکەن، ئەوان لە بەهەشتەوە هەمان هاوار دەکەن کە دۆزەخیی لە دۆزەخەوە. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

بایەزید کوتی " خودا بەندەی تایبەتی وای هەیە کە ئەگەر بۆ سەعاتێک بەهەشت بکاتە حیجابی دیداری خۆی، ئەوان وەها هاوار دەکەن کە دۆزەخیی بۆ ڕزگاریی لە دۆزەخ. " (ل ٢٣٨) هەروەتر هەر دەو کتێبە دا هاتووە: بایەزید کوتی " خودا بەندەی وای هەیە کە ئەگەر چاووێکنانێک لەو دە حیجاب دا بن و هەموو بەهەشتیان بدەنێ، ئەوان حاجەتیان پێی نییە. کەوایە چلۆن مەیلی دونیا و ڕازاوەیی دونیا دەکەن. " (ل ٢٨٧)

**١٠٢. هەروەتر:**

کوتی " عابید بە هەقیقەت و عامیل بە سیدق ئەوکەسەیە کە بە تیغی جەهد سەری هەموو ئارەزووکان ببڕێ و هەموو شەهوەت و تەمەنناکانی لە ئاست مەحەببەتی هەق دا ببێتە هیچ. ئەوەی پێخۆشە کە هەق دەیەوێ و ئەوە ئارەزوو دەکا کە هەق شاهیدی بێ. "

**١٠٣. هەروەتر:**

کوتی " نە مەگەر خودا بە ڕەزای خۆی بەندەکان دەباتە بەهەشت؟ "

کوتیان " بەڵێ! "

کوتی "جا ئەگەر ڕەزای خۆی بداتە کەسێک، ئەو کەسە بەهەشت چ لێبکا."

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتیان " ئایا وانییە کە خودای تەعالا بە ڕەزای خۆی بەهەشت دەدا بە بەندەکانی؟ "

بایەزید کوتی " ئەگەر ڕەزای خۆی بداتە بەندەیەک لە بەندەکانی خۆی، ئەو ئیدی چی لە کۆشکەکانی بەهەشت دەوێ؟ " (ل ١٩٢)

**١٠٤. هەروەتر:**

کوتی " یەک زەڕڕە شیرینایی ئەو دە دڵێک دا، باشترە لە هەزار قەسر لە بەهەشتی ئەعلا. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتی " یەک زەڕڕە شیرینایی مەعرەفەتی وی دە دڵ دا، باشترە لە هەزار قەسر لە بەهەشتی ئەعلا. " (ل ٣٥٤)

**١٠٥. هەروەتر:**

کوتی " دونیا بۆ ئەهلی دونیا غروور لە سەر غروورە و ئاخیرەت بۆ ئەهلی ئاخیرەت سروور لە سەر سروورە و دۆستایەتی هەق بۆ ئەهلی مەعرفەت نوور لە سەر نوورە.

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتی " دونیا بۆ ئەهلی دونیا، غروور لە سەر غروورە و ئاخیرەت بۆ ئەهلی ئاخیرەت سروور لە سەر سروورە و مەحەببەتی هەقتەعالا بۆ ئەهلی مەحەببەت نوور لە سەر



نوورە. جا سروور دە دونیا دا سروور لە غروورە و سروور لە ئاخیرەت سروور لە سروورە و سروور لە دۆستایەتی خودا، سروورێک لە نوورە " (ل ٢٠٩)

**١٠٦. هەروەتر:**

کوتی " ئەگەر فانیین، بگەڕێنەوە سەر قاعیدەی فەنای ئەووەڵ هەتا بگەنە ئەو حەدیسە، دەنا ئەو سەلاح و زوهدە بایە کە لە ئێوە دەدا. "

**١٠٧. هەروەتر:**

کوتی " گوناهـ هێندە بۆ ئێوە زیانی نییە کە بێحورمەتی و بە سووک دانانی برایەکی موسڵمان. "

**١٠٨. هەروەتر:**

کوتی "تاکانەیی ئەو گەلێک پیاوی عاجز کرد و گەلێک عاجزی گەیاندە پیاوەتی. "

**١٠٩. هەروەتر:**

کوتی " کاتێک عارف بێدەنگ بێ، مەبەستی ئەوەیە کە دەیەوێ دەگەڵ هەق قسان بکا و کاتێک چاو وێکبنێ، مەبەستی ئەوەیە کە وەختایەک بیکاتەوە هەقی پێببینێ و کاتێک سەر دەخاتە سەر ئەژنۆ، تەڵەبی ئەوە دەکا کە سەر هەڵنەهێنێتەوە هەتا ئیسرافیل فوو لە سوور دەکا، لەبەر ئەو هیوا زۆرەی کە بە هەقی هەیە. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کاتێک عارف خامۆش دانیشێ دەیەوێ قسە نەکا ئیللا دەگەڵ ئەو نەبێ و کاتێک چاو وێکدەنێ دەیەوێ هەڵینەهێنێ جگە بە دیداری ئەو و کاتێک سەر دەخاتە سەر ئەژنۆ دەیەوێ هەڵینەهێنێتەوە هەتا نەفخی سوور، لەبەر زۆریی ئونس بە ئەو. " (ل ٢٢١)

**١١٠. هەروەتر:**

کوتی " عەلامەتی ناسینی هەق، ڕاکردن لە خەڵکە و خامۆش بوون دە مەعرەفەتی ئەو دا. "

**١١١. هەروەتر:**

کوتی " سواری دڵ بە و پیادەی لەش "

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

--------------------

کوتی " سواری دڵ بە و پیادەی لەش. " – یانی یەک ساعەت دڵ لە بیر و زیکری ئەو دامەبەزێنە و یەکدەم لەش لە خزمەت کردن ڕامەگرە. – (ل ٣٥٥)

هەر دەو کتێبە دا لاپەڕەی ٢٢١ وەها هاتووە: کوتی " سوارەی دڵ بە و پیادەی نەفس. "

**١١٢. هەروەتر:**

کوتی " هەرکەس موبتەلای هەق بوو، مەملەکەت لەو درێغ ناکەن، ئەو خۆی بۆ هەر دوو سەرا، سەر دانانەوێنێ. "

**١١٣. هەروەتر:**

کوتی " ئەشقی وی هات و هەرچی لەو خوارتر بوون ڕایماشت و هیچی نەهێشت هەتا بە تاکانەیی ماوە، وەها کە خۆی تاکانەیە. "



**١١٤. هەروەتر:**

کوتی " کەمالی عارف، سووتانی ئەوە دە دۆستایەتی هەق دا. "

**١١٥. هەروەتر:**

کوتی "سبەی ئەهلی بەهەشت دەچنە زیارەت. کە دەگەڕێنەوە، گەلێک سوورەتیان پێدەنوێنن، هەرکەس سوورەتێک هەڵبژێرێ، ئەو بۆ زیارەت ڕێ نادەن. "

**١١٦. هەروەتر:**

کوتی " بۆ بەندە هیچ لەوە باشتر نییە کە بێ هیچ بێ. نە زوهد و نە عیلم و نە عەمەل. چون بێ هەموان بێ، دەگەڵ هەموان دەبێ. "

**١١٧. هەروەتر:**

کوتی " ئەو حەکایەتە ئەلەمی دەوێ کە لە قەڵەم هێچ پێکنایە. "

**١١٨. هەروەتر:**

کوتی " تەلەبی عیلم و ئەخبار لایقی کەسێکە کە لە عیلمەوە بۆ مەعلووم بچێ و لە خەبەرەوە بۆ موخبیر، بەڵام هەرکەس بۆ فەخر عیلمێک بخوێنێ و روتبە و خۆهەڵکێشانی مەبەست بێ هەتا مەخلووقێک ئەو قەبووڵ بکا، هەر ڕۆژ دوورتر دەبێتەوە و دوورکەوتووتر دەمێنێتەوە. "

**١١٩. هەروەتر:**

کوتی "دونیا کوا ئەو قەدەرەی هەیە کە کەسێک وەلانانی پێ بە کارێکی گرینگ بێ "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

ئەبوو مووسا کوتی " بایەزید لە منی پرسی: ئەی ئەبوومووسا! عەبدولرەحیم لە کام فەن لە فەننەکانی کەلام، دەدوێ؟ —و ئەو عەبدولرەحیمە عالیمێک بوو لە بەستام —کوتم: لە فەننی زوهد لە کاری دونیا دا. جا کوتی: قەدری دونیا خۆی چیە هەتا کەسێک سەبارەت بە زوهد لە دونیا قسە بکا. " (ل ٢٥٩)

**١٢٠. هەروەتر:**

کوتی " لە جۆبارە خوڕێنەکان هاژەی ئاو دەبیسی کە چلۆن دێ؟ کە بگاتە دەریا ئارام دەگرێ و بە هاتن و دەرچوونی ئەو، دەریا کەم و زیاد نابێ. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەهاش هاتووە:

لافاو هەتا تەنیایە هاوار و خرۆشی هەیە. کاتێک بگاتە دەریا و تێکەڵ بە دەریا بێ لەو هاوار و هەرایە ئارام دەگرێ و دەریا لەو خەبەری نییە. نە دەریای زیاد کردووە و نە ئەگەر بگەڕێتەوە شتێک لەو کەم دەبێتەوە. (ل ٢٦٨)

**١٢١. هەروەتر:**

کوتی " مەحاڵە کە کەسێک هەق بناسێ و خۆشی نەوێ، مەعرەفەت بێ مەحەببەت قەدرێکی نییە. "

**١٢٢. هەروەتر:**

کوتی " ئەو بەندەی وای هەیە کە ئەگەر دە دونیا دا سەعاتێک لەوان مەحجووب بێ، دەفەوتێن و فەوتاو چۆن عیبادەت بکا؟ "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتی " خودا بەندەی وای هەیە کە ئەگەر دە دونیا و ئاخیرەت دا بچێتە نێو حیجابەوە، ئەو عیبادەت ناکەن. " (ل ٢٧٥)



هەروەتر دە کتێبی کشف المحجوب دا هاتووە:

بایەزید کوتی " ان الله عبادا لو حجبوا عن الله فی الدنیا و الاخرة لارتدوا. " خودا بەندەی وای هەن کە ئەگەر لە دونیا و عوقبا چاوترووکانێک لێی مەحجووب بن دەبن بە مورتەد. (ل ٤٨٧)

**١٢٣. هەروەتر:**

کوتی " هەرکەس خودا بناسێ، زمان بە قسەی دیکەی جگە لە یادی خودا ناتوانێ بکاتەوە. "

**١٢٤. هەروەتر:**

کوتی " ئەگەر لە عەرش هەتا قورش سەدهەزار بەشەر بێن، بە عەولادی زۆر و بەرەی بێ ئەژمار و سەدهەزار فریشتەی نزیک وەک جبرەییل و میکاییل لە عەدەمەوە پێ بنێنە زاویەی دڵی عارف، لە ئاست وجوودی مەعرەفەتی هەق ئەوان بە مەوجوود دانانێ و لە هاتن و دەرکەوتنیان ئاگادار نییە و ئەگەر بە پێچەوانەی ئەوە بێ. مووددەعییە نەک عارف. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

بایەزید کوتی " ئەگەر سەدهەزار فریشتەی وەک جبرەییک و میکاییل و ئیسرافیل دە دڵی عارف دابن لە هەر کونجێک لە کونجەکانی دڵی وی دا، عارف ئاگای لێنییە و هەستی پێناکا و نازانێ کە ئەوان هەر هەن و ئەگەر هەست بە وجوودیان بکا، عارف نییە. " (ل ٢٥١)

**١٢٥. هەروەتر:**

کوتی " عارف مەعرووف دەبینێ و عالیم دەگەڵ عالیم دادەنیشێ. عالیم دەڵێ: من چ بکەم و عارف دەڵێ: ئەو چ بکا؟ "

**١٢٦. هەروەتر:**

کوتی " کەمترین شتێک کە لە عارف واجبە ئەوەیە کە لە ماڵ و مڵک خۆ بپارێزێ و هەق ئەوەیە ئەگەر هەر دوو جەهان لە سەر دۆستایەتی ئەو دابنێ، هێشتا کەم بێ. "

**١٢٧. هەروەتر:**

کوتی " بریا خەڵک توانیبایان بە خۆ ناسین بگەن، کە مەعرەفەتیان لە ناسینی خۆ، بەس بوو. "

**١٢٨. هەروەتر:**

کوتی" هەوڵ بدە هەتا دەمێک دەست بخەی کە دە زەوی و ئاسمان دا جگە لە هەق نەبینی. "

**١٢٩. هەروەتر:**

کوتی " عەلامەتی ئەوە کە هەق ئەوی خۆش دەوێ، ئەوەیە کە سێ خسلەت بدەنە ئەو: سەخاوەتێک وەک سەخاوەتی دەریا و شەفەقەتێک وەک شەفەقەتی هەتاو و تەوازوعێکی وەک تەوازوعی زەوی. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

پرسیان کە " عەلامەتی مەحەببەتی هەقتەعالا چیە؟ "



کوتی " عەلامەتی ئەوە کە هەقتەعالا ئەوی خۆش دەوێ، ئەوە دەبێ کە سێ خسلەتی پێدەدا: سەخاوەتێک وەک سەخاوەتی دەریا و شەفەقەتێک وەک شەفەقەتی هەتاو و تەوازوعێک وەک تەوازوعی زەوی. " (ل ٣٥٣)

**١٣٠. هەروەتر:**

کوتی " حاجی بە قالب بە دەوری ماڵ دا تەواف دەکەن و بەقایان دەوێ؛ ئەهلی مەحەببەت بە قەلب بە دەوری عەرش دا تەواف دەکەن و لەقایان دەوێ. "

**١٣١. هەروەتر:**

کوتی " دە عیلم دا عیلمێک هەیە کە عولەما نایزانن و دە زوهد دا زوهدێک هەیە کە زاهیدان نایناسن. "

**١٣٢. هەروەتر:**

کوتی " هەرکەس کە هەڵبژێرێ، فیرعەونێکی لە سەر دادەنێ هەتا ئەو برەنجێنێ. "

**١٣٣. هەروەتر:**

کوتی " ئەو هەموو وتووێژ و مەشغەڵە و بانگ و حەرەکەت و ئارەزوویە لە دەرەوەی پەردەیە، دە دەروونی پەردە دا خامۆشیی و بێدەنگیی و ئارام و هەیبەتە. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتی " لە بەر دەرگای ماڵ هاوارە و شیوەن و بێ ئۆقرەیی لە تاوی خاوەنی ماڵ و خۆفی ئەو، دە ماڵ دا ئارامیی و تەعزیم و هەیبەت و ئەدەب لە تاو مەعرەفەتی خاوەنی ماڵ. " (ل ٢١٩)

**١٣٤. هەروەتر:**

کوتی " عارف ئەوەیە کە هیچ، سەرینچاوەی لیڵ نەکا و هەر لێڵاییەک کە پێیبگا، ڕوون بێتەوە. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

بایەزید کوتی " هیچ شتێک عارف لیڵ ناکا و هەموو شت بۆ ئەو پاکە. " (ل ١٩٩)

هەروەتر دە مناقب العارفین دا هاتووە:

دەروێشێک لە حەزرەتی مەولانا پرسیاری کرد کە " عارف کێیە؟ "

فەرمووی کە " عارف کەسێکە کە هیچ لێڵایەتی و ناپاکییەک سەرچاوەی ڕوونی ئەو لیڵ نەکا کە العارف لا یتغیر و هەر لێڵایەتییەک کە بەو بگا ڕوون و پاک بێتەوە. "

**١٣٥. هەروەتر:**

کوتی " قسەی پیاوچاکان باشترە لە کاری چاک و قسەی پیاوخراپان خرابترە لە کاری خراپ. "

**١٣٦. هەروەتر:**

کوتی " هەموو کارەکان لە موجاهیدە دا دەبێ بکەی، ئەویش فەزلی خودا ببینی نەک فێعلی خۆ. "



**١٣٧. هەروەتر:**

کوتی " هەرکەس خودای ناسی، ئەو پێویستی بە پرسیار نییە و نابێ و هەرکەس نەیناسیوە، لە قسەی عارف ناگا. "

**١٣٨. هەروەتر:**

کوتی " هەرکەس تەرکی هەوای کرد، گەیشتە هەق. "

**١٣٩. هەروەتر:**

کوتی " ئاگر، عەزابی ئەو کەسەیە کە خودا نەناسێ بەڵام خودناسان بۆ ئاگر، عەزابن. "

**١٤٠. هەروەتر:**

کوتی " هەرچی کە هەیە بە دوو هەنگاوان پێکدێ. هەنگاوێک بنێتە سەر نەسیبەکانی خۆی و هەنگاوێک بە فەرمانی هەق. ئەو یەک هەنگاوە هەڵگرێ و ئەوی دیکە لە سەر جێی دابنێ. "

**١٤١. هەروەتر:**

کوتی " هەرکەس بە هەق عارفە، جاهیلە و هەرکەس جاهیلی هەقە، عارفە. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

بایەزید کوتی " بەندە هەتا نەزانە عارفە و کاتێک جەهلەکەی بفەوتێ، مەعرەفەتەکەی تەواو دەبێ. " (ل ٢٥٤)

**١٤٢. هەروەتر:**

کوتی " عارف تەییارە و زاهید سەییار.

--------------------

دە کتێبی رسالە قشیریە دا هاتووە:

عارف باڵندەیە و زاهید ڕەوەندە. (ل ٥٤٦)

**١٤٣. هەروەتر:**

کوتی "هەرکەس لە نزیک هەق بێ، هەموو شت و هەموو جێگەیەکی دەبێ، چونکە هەق لە هەموو جێگەیەکە و هەق هەموو شتی هەیە."

**١٤٤. هەروەتر:**

کوتی " هەرکەس خودای ناسی، عەزابێک دەبێ بۆ ئاگر و هەرکەس خودای نەناسی ئاگر لێیدەبێتە عەزاب. هەرکەس خودای ناسی، سەوابێک دەبێ بۆ بەهەشت و بەهەشت بۆ ئەو عەزاب و وەباڵە. "

**١٤٥. هەروەتر:**

کوتی " نیفاقی عارفان فازیلترە لە ئیخلاسی مریدان. "

--------------------

دە کتێبی کشف المحجووب دا هاتووە:

ئەبوویەزید کوتی " نفاق العارفین افضل من اخلاص المریدین. " نیفاقی پێگەیشتوان فازیلتر لە ئیخلاسی تالیبان. یانی ئەوەی کە بۆ مرید مەقامە بۆ کامیل حیجابە. – (ل ٤٢٦)

**١٤٦. هەروەتر:**

کوتی " ئەوەیکە ڕەوایەت دەکەن کە ئیبراهیم و مووسا و عیسا کوتوویانە: خودایە! ئێمە بکە بە ئوممەتی مەحەممەد. پێتوایە کە



ئارەزووی فەزیحەت و ریسوایی ئەو تاقمە ریاسەتخوازەیان کردووە؟ کەللا و حاشا! بەڵکە ئەوان دەو ئوممەتە دا پیاوی وایانبینی کە پێیان لە سەر ڕووی زەوییە و سەرەکانیان لە عەرشی ئەعلا تێپەڕێوە و ئەوان دەو نێوە دا ونن. "

**١٤٧. هەروەتر:**

کوتی " حەزی ئەولیا لە تەفاوەتی دەرەجە دا لە چوار ناوە: هو الاول و الاخر و الظاهر و الباطن. هەرکەس لەو ناوانە حەزی زۆرتر لە زاهیر بێ، لە زاهیری عەجایبی قودرەتی وی نیگەرانترە. هەرکەس کە لەو ناوانە حەزی لە باتین بێ، نیگەران دەبێ لەوەی کە لە ئەسرار و ئەنوار پەیدا دەبێ. هەرکەس لەو ناوانە حەزی لە ئەووەڵ بێ، پیشەی ئەوەیە کە بۆ پاش گەڕاوەتەوە. هەرکەس لەو ناوانە حەزی لە ئاخر بێ، پیشەی ئەو بە داهاتووەوە دەبەسترێ بەوەی کە دێتە پێش. هەروەتر هەرکەس نەسیبی لەو کەشفە بە قەرا تاقەتی وی دەبێ. "

**١٤٨. هەروەتر:**

کوتی " ئەگەر هەموو ئەو دەوڵەتەی کە خەڵک هەیانە، حەواڵەی تۆ بکرێ، وابەستە مەبە و ئەگەر هەموو بێ دەوڵەتییەکان بکەوێتە سەر ڕێگات، هیوابڕاو مەبە کە کاری خودا کن فیکون – ە. "

**١٤٩. هەروەتر:**

کوتی " هەرکەس کە دڵی خۆی لەبەر داوای مەیل و شەهوەت زۆر مراند، ئەو دە کفنی لەعنەت دەپێچنەوە و لە خاکی نەدامەت دەینێژن.

هەرکەس نەفسی خۆی بمرێنێ لە ڕاگرتنی مەیل و شەهوەت، دە کفنی ڕەحمەتی دەپێچنەوە و لە خاکی سلامەت دەینێژن. "

**١٥٠. هەروەتر:**

کوتی "بە هەق نەگەیشت ئەوەیکە گەیشت مەگەر بە ڕاگرتنی حورمەت و لە ڕێ نەکەوت ئەوەیکە کەوت مەگەر بە تەرکی حورمەت."

**١٥١. هەروەتر:**

کوتی " هەرگیز ئەم حەدیسە بە تەڵەب دەست ناکەوێ، بەڵام جگە لە تالیبان دەستیان ناکەوێ.

**١٥٢. هەروەتر:**

کوتی " هەرکات مرید نەعرەتەی لێبدا و هاوار بکا، حەوزێکە و هەرکات خامۆش بێ دەبێتە دەریایەکی پڕ لە دوڕ. "

**١٥٣. هەروەتر:**

کوتی "هەرکەس سەوابی خودای لێ بکەوێتە سبەی، خۆی ئەوڕۆ هەر عیبادەتی نەکردووە چونکە سەوابی هەر هەر نەفەسێک لە موجاهیدە دەستبەجێ حاسڵ دەبێ."

--------------------

دە کتێبی کشف المحجوب دا هاتووە:

ئەبوویەزید دەڵێ " هەرکەس سەوابی عیبادەتی بکەوێتە سبەی، خۆی ئەوڕۆ هەر عیبادەتی نەکردووە، چونکە سەوابی هەر نەفەسێک لە موجاهیدە دەستبەجێ حاسڵە. " (ل ٤٨١)



**١٥٤. هەروەتر:**

کوتی " یا وەها خۆ بنوێنە کە هەی یا وەها بە کە خۆ دەنوێنی. "

**١٥٥. هەروەتر:**

کوتی " عیلم غەدرە و مەعرەفەت مەکرە و موشاهیدە حیجاب، جا کەی دەگەی بەوەی کە تەڵەبی دەکەی؟ "

**١٥٦. هەروەتر:**

کوتی " نەفس سفەتێکە کە هەرگیز پەروەردە نابێ مەگەر بە باتڵ. "

--------------------

دە کتێبی کشف المحجوب دا هاتووە:

ئەبوویەزید دەڵێ: النفس صفة لاتسکن الا بالباطل. نەفس سفەتێکە کە ئارام ناگرێ جگە بە باتڵ. (ل ٣٠١)

**١٥٧. هەروەتر:**

کوتی "ژیان دە عیلم دایە و ڕاحەت دە مەعرەفەت و ڕزق دە زیکر دایە."

**١٥٨. هەروەتر:**

کوتی "شەوق دارەلمولکی ئاشقانە. لەو دارەلمولکە تەختێکی لە سیاسەتی فەراقی داناوە و تیغێکی لە خۆفی هیجران هەڵکێشاوە و چڵێکی نێرگزی ویساڵ داوەتە دەست ڕەجا و لە هەر نەفسێک هەزار سەر بەو تیغە دەپەڕێنێ. "هەروەتر کوتی" حەوت هەزارساڵ تێپەڕیوە، هێشتا ئەو نێرگیزە تەڕ و تازەیە و دەستی هیچ ئەمەلێک بەو نەگەیوە."

**١٥٩. هەروەتر:**

کوتی "مەعرەفەت ئەوەیە کە بزانی حەرەکات و سەکەناتی خەڵک لە خوداوەیە."

--------------------

دە کتێبی کشف المحجوب دا هاتووە:

ئەبوویەزید کوتی " المعرفة ان تعرف ان حرکات الخلق و سکناتهم بالله. " (ل ٤٠٢)

**١٦٠. هەروەتر:**

کوتی "تەوەککول ئەوەیە کە: [هەموو] ژیانت بکەی بە یەک ڕۆژ و بیری سبەی تەواو وەلابنێی. "

**١٦١. هەروەتر:**

کوتی "زیکری زۆر بە ژمار نییە بەڵکە بە حوزووره بەبێ غەفلەت."

**١٦٢. هەروەتر:**

کوتی "مەحەببەت ئەوەیە کە زۆری خۆت پێ کەم بێ و کەمی هەقت پێ زۆر بێ."

--------------------

دە کتێبی کشف المحجوب دا هاتووە:

ئەبوویەزید دەڵێ " المحبة استقلال الکثیر من نفسک، و استکثار القلیل من حبیبک. مەحەببەت ئەوەیە کە زۆری خۆت بە هەندێک دابنێی و هەندێکی دۆست بە زۆر. " (ل ٤٥٦)



**١٦٣. هەروەتر:**

کوتی "ئیختلافی عولەما ڕەحمەتە، مەگەر لە سەر تەجرید و تەوحید. "

--------------------

دە کتێبی کشف المحجوب دا هاتووە:

عملت فی المجاهدة ثلاثین سنة فما وجدت شیئا اشد علی من العلم و متابعته، ولولا اختلاف العلماء لبقیت و اختلاف العلماء رحمة الا فی تجرید التوحید. سی ساڵ موجاهیدەم کرد، هیچم نەبینی لە سەر خۆم کە سەختتر بێ لە عیلم و موتابیعەتی ئەو، ئەگەر ئیختلافی عولەما نەبا من لە هەموو شتێک دەمامەوە و نەمدەتوانی ئەوەی لە سەرمە بەجێی بێنم. ئیختلافی عولەما ڕەحمەتە جگە لە تەجریدی تەوحید دا. (ل ١٦٣)

**١٦٤. هەروەتر:**

کوتی "برسیایەتی هەورێکە کە بێجگە لە بارانی ڕەحمەت نابارێنێ."

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتی " برسیایەتی وەک هەورێکە، هەرکات بەندە برسی بێ بارانی حیکمەت بە سەر دڵی دا دەبارێنێ. " ل ٢٩١ هەروەتر دیسان دەو کتێبە دا هاتووە:

کوتی " برسیایەتی هەورێکە کە بارانی حیکمەت دەبارێنێ و شوومترین خسلەتێک کە پیاوی تێر یادی برسی نەکا. " (ل ٣٦٠)

**١٦٥. هەروەتر:**

کوتی " دوورترین خەڵک لە هەق ئەو کەسانەن کە ئیشارەت زۆر دەکەن. نزیکترین خەڵک لە هەق ئەو کەسانەن کە باری خەڵک دەکێشن و خووی خۆشیان هەیە. "

**١٦٦. هەروەتر:**

کوتی " دڵی عارف وەک چرایەکە دە قەندیلێکی شووشەیی خاوێن دا، کە شۆقی ئەو هەموو عالەم ڕوون دەکاتەوە. ئەو لە تاریکی چ باکی هەیە؟ "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

" ڕەوانی موئمین وەک چرایەکە دە چرادان دا کە لە مەلەکووتی ئەو دەدرەوشێتەوە، چونکە خودا لای کەسێکە کە دەڕوانێتە زاتی وی. " (ل ٢٢١)

**١٦٧.**

پرسیان " فەریزە و سوننەت چیە؟ "

کوتی " فەریزە قسەی مەولایە و سوننەت تەرکی دونیا. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

پرسیان " فەریزە و سوننەت چیە؟ "

کوتی " فەریزە قسەی مەولایە و سوننەت تەرکی دونیا، هەرکەس ئەو فەرز و سوننەتە بزانێ مەعرەفەتی ئەو تەواوە. " (ل ٣٤٨)

**١٦٨. هەروەتر:**

کوتی " فەرامۆشی نەفس، یاد کردنی هەقە و هەرکەس هەق بە هەق بناسێ، زیندوو دەبێتەوە و هەرکەس هەق بە خۆی بناسێ، فانی دەبێ. "



**١٦٩. هەروەتر:**

پرسیان لە زوهد.

کوتی " زوهد چ قیمەتی نییە، چون من سێ ڕۆژ زاهید بووم: ڕۆژی یەکەم لە دونیا و ڕۆژی دووهەم لە ئاخیرەت و ڕۆژی سێهەم لەوەی کە غەیری خودایە. "

--------------------

دە کتێبی ترجمە رسالە قشیریە دا وەها هاتووە:

عەممی بەستامیی دەڵێ کە: لە باوکی خۆمم بیست کە لە ئەبوویەزیدم پرسیم لە سەرەتای حاڵ و زوهدی، کوتی " زوهدی قیمەتێکی نییە! "

کوتم " بۆچی؟ "

کوتی " چونکە من سێ ڕۆژ زاهیدییم کرد و ڕۆژی چوارەم لە زوهد هاتمە دەر. یەکەم ڕۆژ زاهید بووم لە دونیا و هەرچی کە تێیدایە و ڕۆژی دیکە لە ئاخیرەت زاهید بووم و هەرچی کە تێیدایە و ڕۆژی سێهەم زاهید بووم لە هەرچی کە لە دەرەوەی خودایە. ڕۆژی چوارەم هێچ نەمابوو بۆ من جگە لە خودا. " (ل ٣٨)

**١٧٠. دەگێڕنەوە کە:**

یەکێک لە مریدانی شێخ دەچوو سەفەر، کوتی " وەسیەتێکم بکە! "

شێخ کوتی " بە سێ خیسلەت وەسیەتت دەکەم. ئەگەر دەگەڵ پیاوێکی بەدخوو بوویە هاودەم، خووی بەدی ئەو دەگەڵ خووی خۆشی خۆت تێکەڵ بکە هەتا خۆشت لێبگوزەرێ. ئەگەر کەسێک ئەنعامێکی پێکردی لە پێشدا شوکری خودا بکە و پاشان شوکری ئەو کەسە کە خودا دڵی وی لێ مێهربان کردی. ئەگەر بەڵایەکیش ڕووت تێبکا کە لە حەزرەتی عیززەتەوە گەیشتبێ زوو عاجزیی خۆت دەربڕە و هانای بۆ بەرە. "

**١٧١. هەروەتر:**

کوتی " کەماڵی ڕەزای من لەو هەتا ئەو ڕادەیە کە ئەگەر بەندەیەک بۆ هەمیشە بباتە بەهەشتی ئەعلا و من بۆ هەمیشە بنێرێتە ئەسفەلەسافلین، من ڕازیتر دەبم لەو بەندەیە. "

١٧٢.

پرسیان کە " کەی بەندە بە دەرەجەی کەماڵ دەگا؟ "

کوتی " کاتێک عەیبی خۆی بناسێ و هیممەت لە خەڵک هەڵگرێ، ئەوسا هەق بە قەرا هیممەتی وی و بە قەرا دووریی لە نەفسی خۆی، لە خۆی نزیک دەکاتەوە. "

١٧٣.

پرسیان کە " ڕێگە بەرەو هەق چلۆنە؟ "

کوتی " تۆ لە سەر ڕێ هەستە و گەیشتوویە هەق. "

١٧٤.

کوتیان " بە چی دەکرێ بە هەق بگەین؟ "

کوتی " بە کوێریی و کەڕیی و لاڵیی. "

--------------------

دە کتێبی دەفتر روشنایی دا وەها هاتووە:

لە بیدایەتی حاڵی ئەویان پرسی.

شێخ کوتی " هەقتەعالا تۆفیقی زەراعەتی پێدام. لە نەفسی خۆم گەلێک عیبادەتم داچاند. پاشان بەرەو گازریی ڕێی نیشان دام و بە گەلێک تەهارەت شوشتم وەها کە خاتری من دەیەویست، پاک بوومەوە. "

هەروەتر فەرمووی " بەو کارە گەیشتمە کوێریی و لاڵی و کەڕیی. " – یانی جگە لە خودام نەبینی و جگە لە ئەوم نەبیست. (ل ٣٤٦)



١٧٥.

کوتیان " گەلێک قسەی پیرانمان بیستووە و هیچ قسەیەک عەزیمتر لە قسەی تۆ نییە؟ "

کوتی " ئەوان لە بەحری سەفا مەعاملەیان دەکوت و من لە بەحری سەفا سوننەت دەڵێم. ئەوان تێکەڵاو قسە دەکەن و من خالیس قسە دەکەم. تێکەڵاو تێکەڵاو پاک ناکاتەوە. ئەوان کوتیان: تۆ و من. من دەڵێم: تۆ و تۆ. "

١٧٦.

یەکێک وەسیەتی خواست. کوتی " بڕوانە ئاسمان! "

ڕوانی.

کوتی " دەزانی کێ ئەوەی خوڵقاندووە؟ "

کوتی " دەزانم! "

کوتی " ئەو کەسەی کە ئەوەی خوڵقاندووە، لە هەرکوێ کە بی ئاگاداری تۆیە، لەو خۆ بپارێزە. "

١٧٧.

یەکێک کوتی " ئەو تالیبانە لە سیاحەت ناحەسێنەوە. "

کوتی " ئەوەیکە مەقسوودە موقیمە نەک مسافر. موقیم تەڵەب کردن لە سەفەر دا مەحاڵە. "

١٧٨.

کوتیان " دەگەڵ کێ قسان بکەین؟ "

کوتی " ئەو کەسەی کە وەختایەک نەخۆش کەوتی سەرت بدا و کاتێک گوناهێکت کرد، تۆبە قەبووڵ بکا و هەرچی هەق سەبارەت بە تۆ دەیزانێ لەو شاراوە نەبێ. "

.١٧٩

یەکێک کوتی " بۆچی شەوانە نوێژ ناکەی؟ "

کوتی " وەختی نوێژ کردنم نییە، من بە دەوری مەلەکووت دا دەگەڕێم و لە هەرکوێ کەوتوویەک ببینم دەستی ئەو دەگرم" —یانی دە دەروونی خۆم دا خەریکم.

.١٨٠

کوتیان " گەورەترین نیشانەی عارف چیە؟ "

کوتی " ئەوەکە دەگەڵ تۆ تەعام دەخوا و دەڕوانێتە تۆ و لە تۆ دەکڕێ و بە تۆی دەفرۆشێتەوە و دڵی لە بەهەشتە و پاڵی وە باڵنجی ئونسەوە دابێ."

**.١٨١ هەروەتر:**

کوتی " عارف ئەوەیە کە دە خەو دا جگە لە خودا نەبینێ و دەگەڵ کەس جگە لەو موافەقەت نەکا و سیڕری خۆی بە جگە لەو نەڵێ."

.١٨٢

پرسیان لە ئەمر بە مەعرووف و نەهی لە مونکیر، کوتی " لە ویلایەتێک بن کە لەوێ ئەمر بە مەعرووف و نەهی لە مونکیر نەبێ، چونکە ئەو دوانە هەردووک ویلایەتی خەڵکن؛ لە حەزرەتی وەحدەت نە ئەمر بە مەعرووف هەیە و نە نەهی لە مونکیر. "

.١٨٣

کوتیان " پیاو کەی بزانێ کە بە مەعرەفەت گەیشتووە؟ "

کوتی " ئەودەم کە فانی بێ لە ژێر ئیتلاعی هەق دا و باقی بمێنێتەوە لە سەر بەساتی هەق، بێ نەفس و بێ خەڵک. کەوایە ئەو فانییەکە باقی و باقییەکە فانی. مردووویەکە زیندوو و زیندوویەکی مردوو، مەحجووبێکی مەکشووف و مەکشووفێکی مەحجووب. "



.١٨٤

کوتیان " دەروێشیی چیە؟ "

کوتی " ئەو کەسەی کە لە کونجی دڵی خۆی پێی دە گەنجێک رۆبچێ — کە پێیدەڵێن **ریسوایی** ئاخیرەت دەو گەنجە دا گەوهەرێک ببینێتەوە کە پێیدەڵێن **مەحەببەت**، هەرکەس ئەو گەوهەرەی ببینێتەوە، ئەو دەروێشە. "

.١٨٥

کوتیان " پیاو دەگاتە خودا؟ "

کوتی " ئەی مسکین! قەت دەگا؟ "

.١٨٦

کوتیان " بە چیت دیتەوە ئەوەی کە دیتتەوە؟ "

کوتی " ئەسبابی دونیام کۆ کردەوە و بە زنجیری قەناعەت بەستم و دە مەنجەنیقی سیدقم نا و بە دەریای ناهومێدییم دادا. "

.١٨٧

کوتیان " عومری تۆ چەندە؟ "

کوتی " چوار ساڵ. "

کوتیان " چلۆن؟ "

کوتی " حەفتا ساڵ بوو دە حیجابی دونیا دابووم، بەڵام چوار ساڵە کە ئەو دەبینم وەها کە مەپرسە، و ڕۆژگاری حیجاب بە عومر ناژمێردرێن. "

.١٨٨

ئەحمەدی خەزروویە بە شیخی کوت " ناگەمە نەهایەتی تۆبە! "

شێخ کوتی " نەهایەتی تۆبە عیززەتێکی هەیە و عیززەت سفەتی هەقە، مەخلووق کوا دەستی پێڕادەگا؟ "

--------------------

دە دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

ئەحمەد ئیبنی خەزروویە بە بایەزیدی کوتی " ناگەمە تۆبە! "

بایەزید کوتی " العزةلله و تۆ عیززەت دەخوازی! " (ل ٢٣٣)

.١٨٩

پرسیان لە نوێژ.

کوتی " وەسڵ بوون و پێوەلکانە و هەمیشە نییە مەگەر دوای هەڵبڕان. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

بایەزید پیاوێکی بینی کە لە مزگەوتی وی نوێژ دەکا، کوتی " ئەگەر پێتوایە ئەو نوێژەی تۆ وەسڵ بوون و پێوەلکانە وەها نییە کە ئەمە هەڵبڕانە. ئەگەر ئەو تەرک بکەی کافر دەبی و ئەگەر خۆ بە موشاهیدەی بخافڵێنی، شیرکت کردووە. " (ل ١٩٧)

.١٩٠

کوتیان " بۆ مەدحی برسیایەتی دەکەی؟ "

کوتی " ئەگەر فیرعەون برسی با هەرگیز انا ربکم الاعلی نەدەکوت."

--------------------

دە کتێبی کشف المحجوب دا هاتووە:

لە ئەبوویەزیدیان پرسی کە " بۆ زۆر مەدحی برسیایەتی دەکەی؟ "



کوتی " ئادی، ئەگەر فیرعەون برسی با هەرگیز انا ربکم اعلی نەدەکوت و ئەگەر قاروون برسی با سەرکێش نەدەبوو و سەعلەبە (ثعلبە بن حاطب) هەتا برسی بوو بە هەموو زمانەکان پەسنیان دەکرد، کاتێک تێر بوو نفاق دەرکەوت. " (ل ٥١٢)

**١٩١. هەروەتر:**

کوتی " خۆخواز بۆنی مەعرەفەتی پێناگا. "

کوتیان " نیشانەی خۆخواز چیە؟ "

کوتی " ئەوەکە لە هەژدە هەزار عالەم دا نەفسێک ببینی لە نەفسی خۆی خرابتر."

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتی " لە خۆخوازیی بۆنی مەعرەفەت نایە. "

کوتیان " نیشانەی خۆخوازیی چیە؟ "

کوتی " ئەوەکە لە هەژدە هەزار عالەم دا کەسێک ببینی لە خۆی خرابتر." (ل ٣٥٢)

**١٩٢. هەروەتر:**

کوتی " خەڵک عیلم لە مردوان فێر بوون و ئێمە لە زیندوویەک کە قەت نامرێ. "

--------------------

دە کتێبی تلبیس ابلیس دا وەها هاتووە:

دەگێڕنەوە کە:

لە مەجلیسی بایەزید دەیانکوت " فڵان لە فڵان حەدیسی بیستووە و نووسیویەتی و فڵانی بینیوە. "

بایەزید کوتی " بێچارە مردوودڵان کە عیلمی خۆ لە مردوان فێر بوون، ئێمە عیلمی خۆمان لە زیندوویەک فێر بووین کە هەرگیز نامرێ. " (ل ٢٢٥)

.١٩٣

کوتیان " به سەر ئاو دا دەڕۆی! "

کوتی " کوتە داریکیش بە سەر ئاو دا دەڕوا. "

کوتیان " بە هەوا دا دەفڕی! '

کوتی " باڵندە بە حەوا دا دەفڕێ "

کوتیان " بە شەوێک دەچیە کەعبە! "

کوتی " جادوویەکیش بە شەوێک لە هیندەوە دەچێتە دەماوەند. "

کوتیان " کەوایە کاری پیاوان چیە؟ "

کوتی " ئەوە کە دڵ بە کەس نەبەستێ جگە لە خودا "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

دەگێڕنەوە کە:

پیاوێک هاتە لای شێخ و پرسی کە " من سەبارەت بە تۆ گەلێک کەرامەت دەبیسم و سەرم سوڕ دەمێنێ شتێک بڵێ هەتا شک لە دڵی من هەڵبگری. "

شێخ کوتی " چ دەبیسی؟ "

ئەو پیاوە کوتی " دەڵێن کە تۆ بە سەر ئاو دا دەڕۆی و بە حەوا دا دەفڕی و لە نێوان بانگی نوێژ و قامەت دەچیە مەککە و نوێژ دەکەی و دەگەڕێیەوە. "

شێخ کوتی " ئەوە چ خەتەرێکی هەیە؟ مەل و ماسی کە ئەوان سەواب و سزایان نییە لەوە پتری دەکەن. هێزی موئمین بە دەرەجە لەوان پترە و جندۆکەیەک بە کەمتر لەو ماوەیە دەچێتە مەککە و خەبەر دێنێتەوە و نائاگا پیاوێک دەبێ ئەوەی کە دێوێک بە پتر لە موئمین دابنێ. " ئەوسا وەختی خۆش بوو و لەرزێکی تێکەوت و کوتی " مەردی مەردانە ئەوکەسەیە کە مەککە بێتە لای ئەو و کەعبە بە دەوری ئەو دا تەواف بکا و لە هاتن و چوونی ئەو کەس خەبەری نییە. " (ل ٣٥٠)

هەر دەو کتێبە دا دیسان هاتووە کە:

پیاوێک بە بایەزیدی کوت کە : بیستوومە کە تۆ نە دەمێک لە مەشریقەوە دەچیە مەغریب. "



بایەزید کوتی " دەکرێ وا بێ، بەڵام ئەوە بۆ موئمین ڕەنجە. موئمین وەک گەوهەرێکە کە لە هەرکوێ دەرکەوێ، مەشریق و مەغریب لە خزمەت ئەو دان و هەرچی پییخۆش بێ بەهرەی لێوەردەگرێ. " (ل ٢٤٢)

دە کتێبی مقالات شمس تبریزی دا هاتووە:

بە [بایەزیدی] بەستامییان کوت کە: تۆ بە سەر ئاو و حەوا دا دەڕۆی. کوتی: داری ویشکیش بە سەر ئاو دا دەڕوا، مەلانیش بە ئاسمان دا دەفڕن، جادووگەرانیش بە شەوێک لە قافەوە هەتا قاف دەڕۆن، کاری پیاوان ئەوەیە کە دڵ بە هیچ نەدا جگە لە خودای تەعالا. (ب ٢ ل ١٩٧)

دە کتێبی اللمع فی التصوفیش دا هاتووە:

بە بایەزیدیان کوت " فلانی بە شەوێک دەتوانێ هەتا مەککە بڕوا "

کوتی " شەیتانیش بە دەمێک دەتوانێ لە مەشریقەوە بچیتە مەغریب، دە حاڵێک دا کە شەیتان دەرکراوی دەرگا و دە لەعنەتی خودا دایە. "

کوتیان " فلانی بە سەر ئاو دا دەڕوا. "

کوتی " مارماسی بە ئاو دا و باڵندە بە حەوا دا لەو سەیرتر دەڕۆن. " (ل ٣٥٥)

هەروەتر ڕەوایەتێکی نزیک بەوە سەبارەت بە ئەبووسەعیدی ئەبولخەیر هەیە دە کتێبی اسرار التوحید دا:

بە شیخیان کوت " فلانە کەس بە سەر ئاو دا دەڕوا! "

کوتی " سەهلە، بۆق و چۆلەکەمشکەش دەڕۆن! "

کوتیان " فلانە کەس بە حەوا دا دەفڕێ! "

کوتی " مێش و قەلیش دەفڕن. "

کوتیان " فلانە کەس بە دەمێک لە شەرێکەوە بۆ شارێک دەچێ. "

شێخ کوتی " شەیتانیش بە یەک نەفەس لە مەشریقەوە دەچێتە مەغریب. ئەو شتانە زۆر قیمەتیان نییە. مەرد ئەوەیە کە لە نێو خەڵک دانیشێ و هەستێ و بخەوێ و لە نێو بازاڕ دەگەڵ خەڵک بکڕێ و بفرۆشێ و تێکەڵ بە خەڵک بێ و یەک دەم، بە دڵ لە خودا غافڵ نەبێ. " (ب ١ ل ١٩٩)

هەروەتر مەولەویش دە کتێبی فیهی ما فیهی دا سەبارەت بەو ڕوانگەیە دەڵێ:

یەکێک لێرەوە بە ڕۆژێک یا بە ئانێک بچێتە کابە، هێندە سەیر و کەرامات نییە. بای سەموونیش ئەم کەراماتەی هەیە: بە دانێک و بە ئانێک، هەر کوێ کە بیەوێ بچێ. کەرامات ئەوەیە کە تۆ لە

حاڵی نزمەوە بۆ حاڵی بەرز بەرێ و لەوێوە بۆ ئێرە سەفەر بکەی و لە نەزانین بەرەو ئەقڵ و لە جەمادیی بەرەو حەیات. وەها کە لە پێشدا خاک بووی، جەماد بووی، تۆیان بۆ عالەمی گیا هێنا. لە عالەمی گیا سەفەرت کرد بۆ عالەمی عەلەقە و ئاولەمە. لە عەلەقە و ئاولەمە بەرەو عالەمی حەیوانیی و لە حەیوانییەوە بۆ عالەمی ئینسانیی سەفەرت کرد، کەرامات ئەوەیە. (ل ١٢٧)

**١٩٤. هەروەتر:**

کوتی " پێموابوو کە من ئەوم خۆش دەوێ. کاتێک چاوم لێکرد دۆستایەتی وی لە هی من کۆنتر بوو. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتی " سەرەتای کار لە غەڵەت دابووم، پێموابوو کە ئەوە منم کە یادی ئەو دەکەم، کەچی ئەو بوو کە بەر لە من یادی منی دەکرد. پێموابوو کە منم لە تەڵەبی ئەو دام کەچی ئەو بوو لە تەڵەب من دا بەر لە تەڵەبی من. پێموابوو کە من ئەو دەناسم، کەچی ئەو بوو کە منی دەناسی بەر لەوەی کە من ئەو بناسم. پێموابوو کە من ئەوم خۆش دەوێ، کەچی ئەو بوو کە منی خۆش دەویست بەر لەوەی کە من ئەوم خۆش ویستبێ. پێموابوو کە ئەوە منم کە ئەو دەپەرستم، کەچی ئەو بوو کە هەموو خوڵقێنەرانی زەوی خستبوو خزمەتی منەوە. " (ل ٢٠٨)

**١٩٥. هەروەتر:**

کوتی " دڵیان بردمە ئاسمان. بە دەوری هەموو مەلەکووت دا گەڕا و گەڕاوە. کوتم: چت هێناوە؟ کوتی: مەحەببەت و ڕەزا، کە پادشا ئەو دوانە بوون. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتی " دڵیان بردمە ئاسمان. تەوافی کرد و گەڕا و گەڕاوە. کوتم: چت دەگەڵ خۆت هێناوە؟ کوتی: دۆستایەتی و ڕەزا. "(ل ٢٤٦)



**١٩٦. هەروەتر:**

کوتی " هەموو بە هەق دەڵێن و من لە هەق دەڵێم. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتی " هەموو بەو دەڵێن و من لەو. " (ل ١٧٦)

**١٩٧. هەروەتر:**

کوتی " نەفسم بەرەو خودا بانگ کرد، جوابی نەدامەوە. تەرکی ویم کرد و تەنیا چوومە حەزرەت. "

**١٩٨. هەروەتر:**

کوتی " ویستم سەختترین سزای لەشی خۆم بزانم. هیچم خرابتر لە غەفلەت نەبینی و ئاگری دۆزەخ دەگەڵ پیاو ئەوە ناکا کە زەڕڕەیەک غەفلەت دەیکا. "

- --------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتی " جار هەیە لە نێوان سزاکانی خودا بۆ نەفسی خۆم لە سەختترینیان دەگەڕێم، ئەوەند کە ئەو نەفسە خراپەی دەگەڵ من کردووە. جا لە نێو هەموو سزاکانی خودا بیری خۆم دەگێڕم و سزایەکی سەختتر لە غەفلەت نادۆزمەوە. چونکە چاووێکنانێک غەفلەت لە خودا سەختترە لە عەزابی دۆزەخ. " (ل ٢٤٩)

**١٩٩. هەروەتر:**

کوتی " کاری ژنان لە کاری ئێمە باشترە، کە ئەوان مانگێ جارێک غوسڵێک دەکەن لە ناپاکیی و ئێمە لە هەموو عومرمان دا غوسڵێکمان نەکردووە دە پاکیی دا. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

بایەزید کوتی " حاڵی ژنان لە هی ئێمە باشترە. ژن هەر مانگەی پاک دەبێتەوە و واهەیە دە مانگێک دا دوو جار پاک دەبێتەوە و لە حەیز غوسڵ دەر دەکا و ئێمە دە هەموو عومرمان دا، جارێک پاک نابینەوە. " (ل ١٤٦)

هەروەتر دە کتێبی نورالعلوم دا وەها هاتووە:

بوویەزید کوتی " هەرام لە لەش کرد، کوتم: لا، ولا کرامة، یا ماوی کل سوء! ژنێک بە شەووڕۆژێک پاک دەبێتەوە، غایەتی پازدە شەووڕۆژ، قەولی عولەما لەمە زیادتر نییە، ئەی لەشی گلاو ئەوە سی ساڵە و پاک نەبوویەوە و سبەی تۆ دەبێ لە پێش پاکی پاک بوەستی. " (ل ٨٢)

**٢٠٠. هەروەتر:**

کوتی " دەمێک ساڵە نوێژ دەکەم و بڕوام لە سەر نەفسی خۆم وەها بووە کە: گاورم و زوننار دەبڕم. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتی " پیاو دەبێ وەها بێ کە وەختایەک دەیەوێ نوێژ بکا خۆی بە گاورێک دابنێ کە هەرئێستا زوننار لە قەد دەکاتەوە. " (ل ٣٥٤)



**٢٠١. هەروەتر:**

کوتی " ئەگەر سبەی لە قیامەت بە من بڵێن کە: بۆ نەتکرد؟ پێمخۆشترە لەوە کە بڵێن" بۆ کردت؟ " -یانی هەرچی بکەم بۆ وی منایەتی من بووە و منایەتی شیرکە و شیرک خرابترین گوناهە، مەگەر تاعەتێک بە سەر من دابێ کە من دە ئارا دا نەبم. —

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

کوتی " ئەگەر سبەی لە قیامەت بە من بڵێن کە: بۆ نەتکرد؟ پێمخۆشترە لەوە کە بڵێن" بۆ کردت؟ " — یانی تاعەتی زێدە نەهێنان باشترە لەوە کە گوناهـ کردن. — (ل ٣٦٠)

**٢٠٢. هەروەتر:**

کوتی " هەقم دە خەو دا بینی و پرسیم کە: ڕێگا بەرەو تۆ چلۆنە؟ کوتی: تەرکی خۆت بکە و بە من گەیشتووی. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

یەکێک سەبارەت بە ڕێگای خودا پرسیاری کرد و ئەو بەو پرسیارکەرەی کوت " ئەگەر لە سەر ڕێگا غایب بی، گەیشتوویە هەقتەعالا. " (ل ٢٧٥)

هەروەتر دە کتێبی ترجمە رسالە قشیریە دا وەها هاتووە:

لە بوویەزید دەگێڕنەوە کە:

کوتی " هەقم دە خەو دا بینی کوتم: تۆ چۆن بدۆزمەوە؟ کوتی: خۆ دابنێ و وەرە. " ل ١٥٥ دیسان هەر دەو کتێبە دا هاتووە کە: بوویەزید دەڵێ " هەقتەعالام دە خەو دا بینی کوتم: خودایا! ڕێگەی بەرەو تۆ چۆنە؟ کوتی: دەست لە نەفس هەڵگرە و وەرە. " (ل ٧٠٥)

**٢٠٣. هەروەتر کوتی:**

هەقم دە خەو دا بینی.
بە منی کوت " یا **بایەزید** چت دەویٚ؟ "
کوتم " ئەوەم دەویٚ کە تۆ دەتەویٚ. "
کوتی " من هی تۆم وەها کە تۆ هی منی! "

**٢٠٤. هەروەتر:**

کوتی " خودایە! هەتا کەی دە نێوان من و تۆ دا، منیی و تۆیی هەبیٚ؟ منیی من لەم نێوە هەلگرە هەتا منیی من دەگەڵ تۆ بیٚ، هەتا من هیچ نەبم! "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

ئەبوومووسا کوتی:

شەوێک لە شەوەکان بایەزید دە دوعای خۆی دا دەیکوت " هەتا کەی من و تۆ، ئەو منایەتییە؟ لە تۆ داوا دەکەم کە منایەتی من مەحو بکەی هەتا تۆ ببی بە منایەتی من و تەنیا تۆ بمێنیەوە و جگە لە تۆ، تەنیا، نەبینریٚ ئەی عەزیز! " (ل ٢٦٩)

**٢٠٥. هەروەتر:**

کوتی " خوایە! من زاهیدییم ناویٚ و قورئانخوێنی ریاییم ناویٚ و عالیمییم ناویٚ، ئەگەر دەمکەیە ئەهلی شتێک، بمکە ئەهلی هەندێک لە ئەسراری خۆت و بمگەیەنە دەرجەی دۆستانی خۆت! "



**٢٠٦. هەروەتر:**

کوتی " سەیر نییە کە من تۆم خۆش دەویٚ و من بەندەی عاجز و زەعیف و موحتاج، سەیر ئەوەیە کە تۆ منت خۆش دەویٚ و تۆ خودا و پادشا و بێنیازی. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

بایەزید کوتی " دۆستایەتی من بۆ تۆ سەیر نییە کە من بەندەیەکی دەستبەتاڵم، سەیر دۆستایەتی تۆیە دەگەڵ من کە تۆ پادشایەکی توانای. " (ل ٢٣٧)

**٢٠٧. هەروەتر:**

کوتی " خودایە! هەتا دەگەڵ تۆم، پتر لە هەموانم و هەتا دەگەڵ خۆمم، کەمتر لە هەموانم! "

**٢٠٨. هەروەتر:**

یەکێک لێیپرسی کە " عەرش چیە؟ "
کوتی " منم! "
کوتی " کورسی؟ "
کوتی " منم! '
کوتی " لەوح و قەڵەم؟ "
کوتی " منم! '
کوتیان " خودا بەندەی هەیە وەکوو ئیبراهیم و مووسا و مەحەممەد؟ "
کوتی " هەموویان منم! "

کوتیان "خودا بەندەی هەیە وەکوو جبرەییل و میکاییل و ئیسرافیل و عیزراییل؟ "

کوتی " هەموویان منم! "

پیاوەکە بێدەنگ بوو.

**بایەزید** کوتی " بەڵێ. هەرکەس دە هەق دا مەحو بێ دەگاتە هەقیقەتی ئەوەی کە هەیە. هەموو هەقن. ئەگەر ئەو کەسە [وجوودی] نەبێ، هەق گشت خۆی ببینێ، سەیر نییە. "

--------------------

دە کتێبی تلبیس ابلیس دا وەها نووسراوە:

ئەبووموسا دەبیلی دەڵێ بە بایەزیدم کوت " بیستوومە سێ کەس هەن کە دڵیان دڵی جەبرەییلە. "

بایەزید کوتی " منم ئەو سێ کەسە. "

پرسیم " چلۆن؟ "

کوتی " دڵم یەکێک و هیممەتم یەکێک و ڕووحم یەکێک. "

کوتم " بیستوومە کەسێک هەیە کە دڵی دڵی ئیسرافیلە؟ "

کوتی " منم ئەو یەک کەسە، وەک دەریایەک بێ سەرەتا و بێ پایان. " (ل ٢٤٠)

**٢٠٩. هەروەتر:**

کوتی " وێنەی من وەک دەریایە کە نە قووڵایی دەبیندرێ و نە ئەووەڵ و ئاخری دیارە. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

بایەزید کوتی " حەکایەتی من حەکایەتی دەریایەکە سەرگەشتە، نە سەرەتا و نە ئاکام " (ل ٢١٧)



**٢١٠. دەگێڕنەوە کە گەورەیەک کوتی:**

شێخم دە خەونم دا بینی، کوتم " وەسیەتێکم بکە! "

کوتی " خەڵک دە دەریایەکی بێنەهایەت دان، دووریی لەوان کەشتیە. هەوڵ بدە هەتا سواری ئەو کەشتیە بی و لەشی هەژار لە دەریا ڕزگار بکەی. "

--------------------

دە کتێبی دەفتەری ڕۆشنایی دا وەها هاتووە:

عەممی [بەستامیی] کوتی " بایەزیدەم دە خەو دابینی و پێمکوت: نەسیحەتێکم بکە. کوتی: الناس بحر عمیق/ و البعد منهم سفینه/ و قد نصحتک فاحفظ/ لنفسک المسکینه. " (ل ٢٣٣)

**٢١١.**

کوتی " ڕووناکتر لە خامۆشیی چرایەکم نەدیت و قسەیەکم باشتر لە بێ قسەیی نەبیست. "

**٢١٢. دەگێڕنەوە کە:**

شێخیان دە خەو دا بینی. کوتیان " تەسەووف چیە؟ "

کوتی " دەرگای حەسانەوە لە سەر خۆ داخستن و لە سەر چۆکی مەینەت دانیشتن. "

۲۱۳.

ئەوە شەوەی کە وەفاتی پێگەیشت، **بووموووسا** غایب بوو. کوتی " دە خەونم دا بینیم کە عەرشم لە بان سەرم دانابوو و دەمبرد و پێم سەیر بوو. بەیانی وەڕێکەوتم هەتا بۆ شێخی بگێڕمەوە. شێخ وەفاتی کردبوو و خەڵکێکی زۆر لە دەوروبەر هاتبوون. کاتێک جەنازەیان هەڵگرت من هەوڵم دەدا گۆشەی جەنازە بدەن بەمن... چوومە بن جەنازە و لە بان سەرم دانا و دەڕۆیشتم و من ئەو خەونەم فەرامۆش کردبوو. شێخم بینی کە کوتی " یا **بووموووسا** ئەوەش تەعبیری خەونەکەی دوێشەو: ئەو عەرشەی کە لە بان سەرت دانابوو جەنازەی **بایەزیدە**. "

**۲۱٤. دەگێڕنەوە کە:**

کاتێک شێخیان ناشت، **ئوممی عەلی** کە ژنی **ئەحمەدی خەزروویە** بوو، هاتە زیارەتی شێخ. کاتێک لە زیارەت فارغ بوو، کوتی " دەزانن کە شێخ **بایەزید** کێ بوو؟ "

کوتیان " تۆ باشتر دەزانی. "

کوتی " شەوێک لە تەوافی کەعبە بووم سەعاتێک دانیشم و خەوم بە سەر داهات وەها کە منیان بردە ئاسمان و هەتا ژێر عەرشم بینی و لەوێ کە ژێر عەرش بووم بیابانێکم بینی کە درێژایی و پانایی دیار نەبوو و هەموو گوڵ و ڕەیحان بوو، لە سەر هەر پەلکی گوڵێک نووسرابوو: ئەبوویەزیدی وەلی



۲۱۵.

کاتێک شێخ **ابو سعید بن ابی الخیر** هاتە زیارەتی شێخ، ماوەیەک وەستا و کاتێک دەگەڕاوە کوتی " ئێرە جێگایەکە کە هەرکەس شتێکی لە عالەم ون کردبێ، لێرە دەیبیبنێتەوە. "

.٢١٦

ئەوان سێ برا و دوو خوشک بوون: **بایەزید** و ئادەم و عەلی. ئادەم گەورەترینی وان بوو و عەلی چووکترین و **بایەزید** نێونجی بوو و ئەبوومووسا خادەمی **بایەزید** کوڕی براکەی وی ئادەم بوو. بوومووسا لە خزمەت **بایەزید** دا گەلێکی هەوڵ دا و بۆ بەجێ گەیاندنی پەیمان و دۆستایەتی وی گەلێکی ڕەنج کێشا و بۆ ڕیز ڕاگرتن و حورمەتی وی زۆر تێکۆشا ووەها کە دەگێڕنەوە بوومووسا بۆ خاتری **بایەزید** وەختی نوێژی ڕادەگرت هەتا ئەو ڕادە کە دەچوو دەروازەی نووحان و بابی نووحان جێگەیەک بوو هەراو کە بۆ دیتنی بەرەبەیان هیچ بەرگرێک نەبوو و کاتێک بەیانی دادەهات ئەوی ئاگادار دەکرد و **بایەزید** لە سەومەعەی خۆی دەچوو مزگەوت.

کوتی ئەو شەوەی کە ڕەوانی **بایەزید** مالاوایی لە لەشی کرد، بوومووسا هات و ئەوی ئاگادار کرد و **بایەزید** نەهاتە دەر. لە دەرگای ماڵی کوتا. جوابێک نەدراوە. چوار جار. هاواری کرد: ئەی **بایەزید!** و هەتا ئەودەم قەت ئەوی بە ناو بانگ نەکردبوو لە تاوی ڕێز و حورمەت جگە لەو شەوە. کاتێک زانی کە نایەتە دەر تێگەیشت کە بەرگرێک لە سەر ڕێگەی هاتنە دەری هەیە. دەرگای کردەوە بینی کە لەم جەهانە دەرچووە.

.٢١٧

ئەبوومووسا خزمەتی **بایەزیدی** دەکرد و لە خزمەت و حورمەت و سوحبەتی ئەو تێدەکۆشا و نەفسی خۆی دەو کارە دا بە تاوانبار دادەنا. بە زەینی دا هات کە " دەبا **بایەزید** خادمێکی دیکەی هەبا کە لە خزمەت دا چالاکتر با. " **بایەزید** سەیری کرد و کوتی " لێیگەڕێ! " یانی لەو بیرە بگەڕێ من نیازمەندی خادمێکی وەک تۆ بووم ...لەوە پتر نیاز نییە.



.٢١٨

شاگردانی **بایەزید** ڕۆژێک لە سەر حورمەت، حورمەتی ئوستاد و پیر، قسەیان دەکرد و هەرکەس لەم بارەوە قسەیەکی دەکرد و ئەبوومووسا بە پەنایان دا تێپەڕی و خەریکی کاری خانەقا و میوانان بوو، پێیانکوت "تۆش شتێک لەم بارەوە، لە بارەی حورمەت، بڵێ! "

بوومووسا کوتی " ئەگەر خودای تەعالا بە بەندەکەی شتێک ڕووناکتر لەو هەتاوە بنوێنێ و ئوستاد ئەوی بە شوێن کارێک لە کارەکانی دونیا ناردبێ و ئەو کارەکە بەربدا ئایا پێتانوایە ئەوە حورمەت ڕاگرتنە؟ "

.٢١٩

ئەبوومووسا بە گۆڕهەڵکەنی خۆی کوتبوو کە " گۆڕی ئەبوومووسا خوارتر لە گۆڕی **بایەزید** هەڵکەنە هەتا لەحەدی ئەو بەرابەر لەحەدی **بایەزید** نەبێ، لەبەر حورمەتی شێخ. "

ئەبوومووسا کوتی " چوارسەد قسەم لە قسەکانی **بایەزید** دەگەڵ خۆم بردە نێو گۆڕەوە چون کەسێکم نەدیتەوە کە بۆ بیستنی ئەهل بێ."

.٢٢٠

**بایەزید** کوتی " دڵێک دەبێ وەک دڵی بوومووسا. " و شێخ ئەبوو عەبدوڵڵا کوتی " ئەو دڵی دڵێنە نەک دڵی گڵێنە. "

هەروەتر بیستم کە دەیکوت " بوومووسا گەیشتبوو ڕادەیەک کە هەرچی بە سەر دڵی **بایەزید** دا تێدەپەڕی، دەیزانی، جا کوتی: خودایا ئەوەم لێوەرگرەوە چونکە من ئەوە بە تەرکی حورمەت دەبینم – یانی لەوەی کە بە سەر دڵی دا تێدەپەڕێ ئاگادار بم. "... هەتا ئەوەکە **بایەزید** بە ڕێگەی خۆی دا ڕۆیشت و کۆچی کرد، ئەبوومووسا بەو مەقام و دەرەجە بڵندە گەیشت.

**٢٢١. هەروەتر:**

کوتی " من ئەو حەکایەتەی ویم زۆر پێخۆشە و ئەوە حەکایەتێکی گەلێک بە سوودە کە شێخ **ئەبووعەبدوڵلا** لە مەشایخی خۆی بیستووە کە لە **ئەبووموسای** دەگێڕنەوە کە: ڕۆژی قیامەت پیاوێک بە حاڵەتێکی گەلێک سەخت لە دۆزەخەوە دێنن و پیاوێکی دیکە لە بەهەشتەوە بە حاڵەتێکی گەلێک باشتر لەوەی کە بکرێ باسی بکەی، هەتا دەرد و ئازاری ئەوەی کە لەوێوە هێناویانە پتر بێ. بەو دەڵێن: ئەو پیاوە دەبینی کە بە وەها شکۆیەک دەچێتە بەهەشت؟ ئەو فلانەکەسە. دەڵێ: ئادی، لە دونیا ناویم بیستبوو. کوتی" جا خودا دەنگی وی دەگەیەنێتە ئەو وەلییە و ئەو لە سەر جێی خۆی دەوەستێ. بەو دەڵێن: بۆ ناڕۆی؟ و ئەو دەڵی: لێرەوە ناچمە هیچکوێ هەتا ئەوکەسەی کە ناوی منی بیستووە نەبێتە هاوڕێم. کوتی: جا نەدا دەکەن کە: ئەومان بە تۆ بەخشی، دەستی بگرە و بچنە بەهەشت. جا شێخ **عەبدوڵلا** کاتێک ئەو حەکایەتەی دەگێڕاوە دەیکوت: ئەوە بەهرەی ئەوکەسەیە کە ناوی بیستووە داخودا ئەوەی کە بینیویەتی و قسەی دەگەڵ کردووە؟ "

.٢٢٢

**بایەزید** وەفاتی کرد و **ئەبووموسا** بیست و دووساڵە بوو. **ئەبووموسا** چوار منداڵی هەبوو، یەک لەوان **عەممی مووسا** بوو، پیاوێکی گەورە و سیاحەب کەرامەت و فەراسەت.

**٢٢٣. دەگێڕنەوە کە:**

شێخ **بایەزید** ساڵێ جارێک دەچوو زیارەتی **دێهستان** – کە قەبری شەهیدانی لێبوو – کاتێک بە **خەرەقان** دا تێدەپەڕی دەوەستا و بۆنی هەڵدەمشت. مریدەکان لەویان پرسی کە " ئەی شێخ ئێمە هیچ بۆنێکمان بۆ نایە. "

شێخ کوتی " ئادی، لەو دێیەی دزان بۆنی پیاوێکم بۆ دێ، پیاوێک دەبێ بە ناوی **عەلی** و کونیەی **ئەبولحەسەن** بە سەد دەرەجە لە من پێشتر دەبێ، باری خاو و خێزان دەکێشێ و کشتوکاڵ دەکا و درەخت دەنێژێ. "

**٢٢٤. دەگێڕنەوە کە:**

شێخ [خەرەقانی] سەرەتا دوازدە ساڵ لە **خەرەقان** نوێژی خەوتنانی بە جەماعەت دەکرد و ڕووی لە خاکی **بایەزید** دەنا و دەچوو **بەستام** و دەوەستا و دەیکوت " ئەی خودایە! لەو خەڵاتەی کە بە **بایەزیدت** داوە، بە بولحەسەنی بۆنێک بدە! " ئەوسا دەگەڕاوە و بەیانی دەگەیشتەوە خەرەقان و نوێژی بەیانی بە جەماعەت لە خەرەقان دەکرد بە تەهارەتی نوێژی خەوتنان.

**٢٢٥. دەگێڕنەوە کە:**

کاتێک دزێک پاشەوەپاش دەڕۆیشت هەتا نەتوانن بیبینن و شوێن پێی هەڵگرن. شێخ [خەرەقانی] کوتبووی" من لە تەڵەبی ئەو حەدیسە دا لە دز کەمتر نیم. لەوە بەدوا لە سەر خاکی **بایەزید** پاشەوپاش دەگەڕاوە و پشتی لە خاکی وی نەدەکرد هەتا دوای



دوازدە ساڵ لە توربەت دەنگێک هات کە " ئەی ئەبولحەسەن! وەختی ئەوە داهات کە دانیشی. "

شێخ کوتی " ئەی **بایەزید!** وەرە هیممەتێکم بکە، پیاوێکم ئوممی و لە شەریعەت هیچ نازانم و قورئان فێر نەبووم. "

دەنگێک هات " ئەی ئەبولحەسەن! ئەوەی بە منیان داوە لە بەرەکەتی تۆوە بووە. "

کوتی " تۆ سەد و سی و چەند ساڵ بەر لە من بووی؟ "

کوتی " بەڵێ بەڵام کاتێک بە خەرەقان دا تێدەپەڕیم، نوورێکم دەبینی کە لە خەرەقانەوە دەچوو ئاسمان و سی ساڵ بوو بۆ حاجەتێک لە خودا دامابووم، نەدایان کردە سەرم کە: ئەی **بایەزید!** شەفاعەت بە حورمەتی ئەو نوورە بەرە هەتا حاجەتت پێکبێ. کوتم: خودایە! ئەوە نووری کێیە و لە کوێیە؟ هاتفێک دەنگی هات کە" ئەوە نووری بەندەیەکی خاسە و بەو دەڵێن ئەبولحەسەن، ئەو نوورە بە شەفاعەت بخوازە هەتا حاجەتت پێکبێ."

٢٢٦.

[خەرەقانی] کوتی " ئەگەر وانەبا کە خەڵک بڵێن: گەیشتۆتە پایگای **بایەزید** و بێحورمەتیی دەکا، هەرچی **بایەزید** بە خودای کوتووە و بیری لێکردۆتەوە بە ئێوەم دەکوت. " و سەیر ئەمەیە کە لەو دەگێڕنەوە کە کوتوویەتی " هەرچێیەک **بایەزید** بە بیر پێیگەیشتووە، ئەبولحەسەن بە قەدەم گەیشتۆتە وێ. "

٢٢٧.

[خەرەقانی] کوتی " لە خوڵقاوان هیچکەس منی نەبینی مەگەر زیندوویەک و ئەویش **بایەزید** بوو. "

٢٢٨.

دەگێڕنەوە لە شێخ **بایەزید** کە کوتوویەتی " لە پاش هەر کارێکی باش کارێکی خراپ مەکە وەها کە ئەگەر چاوت پێیکەوت خراپە ببینی نەک چاکە. "

شێخ [خەرەقانی] کوتی " لە سەر تۆیە کە چاکە و خراپە فەرامۆش بکەی."

--------------------

دە کتێبی نوشتە بر دریا دا وەها هاتووە:

لە بایەزیدیان گێڕاوە کە کوتی " دوای هەر کارێکی باش، کارێکی خراپ بکە هەتا کە چاوت پێیکەوت خراپەی ببینی نەک چاکە. "

شێخ [خەرەقانی] کوتی: " لە سەر تۆیە کە چاکە و خراپە فەرامۆش بکەی و یادی خودا بکەی و بەس. " (ل ٢٠٩)

٢٢٩.

ڕۆژێک [خەرەقانی] لە شاگردێکی پرسی " چ باشترە؟ "

کوتی " نازانم! "

کوتی " جەهان پڕ لە پیاو هەموو هەروەک **بایەزید**. "



**٢٣٠. دەگێڕنەوە کە:**

کاتێک وەفاتی شێخ [خەرەقانی] نزیک بۆوە کوتی " سی گەز خاکم قووڵتر بکەن چونکە ئەو خاکە سەرتر کە خاکی بەستامە، ڕەوا نییە و ئەدەب نییە کە خاکی من سەرتر لە خاکی **بایەزید** بێ. "

٢٣١.

**بایەزید** دەیکوت " خودایە! قەومێک کە بێگانەن لە عەزابدەری خۆیان سبەی لە دەوزەخ عەزاب دەدەی، بۆچ من عەزاب نادەی کە عەزابدەری خۆم دەناسم؟ "

٢٣٢.

**بایەزید** وەجدی دەکرد و نەیدەزانی دە وەجدی چی دایە. هەرکەس لێی پەیدا دەبوو لەوی دەپرسی " ئایا دەوایەک بۆ ئەو دەردی دڵەی من دەناسی؟ "

هەندێک دەیانکوت " فڵانە شتەی بخۆ! " و هەندێک دەیانکوت " فڵانە شتە بخۆوە! " هەتا حاجی لە سەفەری حەج گەڕانەوە و یەک لەوان هاتە زیارەتی **بایەزید** و ئەو سەردەمە ناوبانگی وی لە هەموو جێ بڵاو ببۆوە. **بایەزید** لەویش هەر ئەوەی پرسی و ئەو کوتی " دە هەندێک کتێبان دا بینیومە کە کاتێک خودا بیەوێ کەسێک بۆ دۆستایەتی خۆی هەڵبژێرێ، دڵی ئەو دە بەند و ئیشتیاق داوێ هەتا ساف بێتەوە. کاتێک بە سەفا گەیشت دەیکاتە ئاشقی خۆی و خۆشی ئاشقی دەبێ. یانی ئەو دەکاتە دۆست و خۆشی دەوێ. "

٢٣٣.

هیچکەس خەبەری لە مەرگی **بایەزید** نەبوو، بەڵام ئەو بە یەکێک لە شاگردەکانی خۆی ئیشارەی کردبوو. کەسێک کە ناوی عەبدووڵڵای پوونابادیی بوو و هاتبوو دیداری و دەیەویست بگەڕێتەوە ئاوایی خۆی و ئیزنی رۆیشتنی دەخواست، **بایەزید** پییکوت " مەڕۆ، بڵا هەتا نوێژی جەنازەکەت بکەی. " و ئەو پیاوە نەیدەزانی کە کام جەنازە



دەڵێ. بەڵام ئەوەندەی دەزانی کە **بایەزید** ڕاست دەکا و لەبەر حورمەت داوای زانینی نەکرد. کاتێک بەیان داهات، ئەو جەنازەیە جەنازەی **بایەزید** بوو.

٢٣٤.

**ئەبوویەزید** ئوممی بوو و ئەگەر لە عیلمی زاهیری ئەو شک ڕەوا بێ، لە کەماڵی عیلمی باتینی ئەو دا شکێک نییە.

یەک لە عولەما لاتاوی بە قسەی **بایەزید** دادا و کوتی " ئەوەی کە ئەو دەیڵێ لە جنسی عیلم نییە. "

لە وڵامی ئەو دا کوتی " ئایا تۆ تەواوی عێلم دەزانی؟ "

کوتی " نا! "

کوتی " ئەوەی هی ئەو نیوەی دیکەی عیلمە کە نەگەیشتۆتە تۆ. "

٢٣٥.

لە بیدایەتی حاڵی ئەویان پرسی.

کوتی " ئیزەدی تەعالا منی بۆ زەراعەت ڕێنوێنی کرد و من دە نەفسی خۆم دا گەلێک عیبادەتم داچاند. پاشان بەرەو گازریی ئەمری پێکردم و لەو ڕۆژگارەوە هەمیشە بە گەلێک تەهارەت و ئاو خەریکی شوشتنم کەچی دەبینم هێشتا نەشۆراوە. "

٢٣٦.

**بایەزید** کوتی:

کەسێکی ئەهلی حاڵ هاتە لای من و کوتی " ئەی **بایەزید**! ئەو پلەیەت بە چی دەست کەوت؟ "

کوتم " له پله بگەڕێ، بەڵام هەقتەعالا هەشت کەرامەتی پێبەخشیم له دوایی بانگی کردم کە: ئەی **بایەزید**!

" یەکەم لەو کەرامەتانە ئەمە بوو کە نەفسی خۆم بە دواکەوتوو بینی و خەڵک پێشکەوتووتر له من.

" دووهەم ئەوەکە ڕازی بووم لەبری هەموو خەڵک بچمە دۆزەخ له تاو شەفەقەتێک کە بەوانم هەبوو.

" سێهەم ئەوەکە تەمای من پێکهێنانی شادیی دە دڵی موئمین دا بوو.

" چوارەم ئەوەکە شتێکم بۆ سبەی پاشەکەوت نەکرد.

" پێنجەم ئەوەکە ڕەحمەتی خودام بۆ خەڵک پتر خواست هەتا بۆ خۆم.

" شەشەم ئەوەکە هەوڵی خۆم بۆ شاد کردنی دڵی موئمین و دەر کردنی خەم له دڵی ئەو بە کار هێنا.

" حەوتەم لەبەر شەفەقەتی زۆر بە موئمینان هەرکەسم بینی له پێشدا من سڵاوم لێکرد.

" هەشتەم ئەوەکە کوتم: ئەگەر خودای تەعالا له ڕۆژی قیامەت لێمببووری و ئیزنی شەفاعەتم پێبدا له پێشدا شەفاعەتی ئەو کەسانە دەکەم کە منیان ئازار داوە و جەفایان دەگەڵ کردووم پاشان ئەوانەی کە دە هەق من دا چاکەیان کردووە. "

٢٣٧.

**بایەزید** کوتی " سی ساڵ له خودا گەڕام، جا زانیم کە من ئەوم. پێموابوو کە من لەو دەگەڕێم و ئەو بوو کە له من دەگەڕا. "



٢٣٨.

پیاوێک بە **بایەزیدی** کوت " بۆم بژمێرە؟ "

**بایەزید** دەستی کرد بە ژماردن و دەیکوت " یەک! "

پیاوەکە کوتی " ئەو دەڵیی چی؟ "

کوتی " من جگە له یەک هیچی دیکە ناناسم. هەموو له یەک پەیدا دەبن و یەک له هەموان هەرگیز پەیدا نابێ، چونکە ژمار بێجگە له یەک ناگونجێ. کاتێک بگەیە هەزار و یەک لەو لابەی، هەزار ئیدی نامێنێ. "

٢٣٩.

پیاوێک ئیرادی له **بایەزید** گرت و کوتی " تۆ بە زوهد و عیبادەت دەناسن و من دە تۆ دا عیبادەتێکی وەها نابینم؟ "

**بایەزید** هەڵگەڕا و کوتی " زوهد و عیبادەت و مەعرەفەت له منەوە سەرچاوەی گرتووە. "

٢٤٠.

له یەکێک له مەشایخم بیست کە دەیکوت:

ڕۆژی هەینی **بایەزید** بۆ نوێژ بە تەمای مزگەوتی جامیع بوو. باران بارییوو و ڕێگا قوڕ بوو. پێی هەڵخلیسکا و پەنجەی بە دیوارەوە نا. بەو کارە نەیهێشت بکەوێ. ماوەیەک وەستا و بیری کردەوە و دە دڵ دا کوتی " دیتنەوەی خاوەنی ئەو دیوارە و ڕەزای ئەو دەست خستن باشترە له چوون بۆ مزگەوت. چونکە ئەو کارە قەزا نابێ و هێشتا وەخت هەیە. " جا چوو و له خاوەنی دیوار گەڕا. کوتیان پیاوێکی گاورە. چوو بەر دەرگای و بانگی کرد. پیاوەکە هات و **بایەزید** نەقڵەکەی بۆ گێڕاوە و گەردنازایی لێخواست.

گاور کوتی " ئێوە دە ئایینەکەتان دا ئەوەندە وردبینی و ئیحتیاتتان هەیە؟ "
ئیمانی هێنا.

٢٤١.

لە **بایەزید**یان پرسی " ئایا لە نێوان عارف و خودای تەعالا شتێک دەبێتە حیجاب؟ "

کوتی " نا، چونکە حیجابی ئەو کەسایەتی ئەوە. کەسێک کە خۆی حیجابی خۆیەتی، چ شتێک دەبێتە حیجابی وی؟ "

٢٤٢.

ئەبوومووسا دەبیلی گێڕایەوە - و ئەو عالیم و فازل بوو — کوتی " چوومە لای **بایەزید** و دیداری ئەو شادمانی کردم و گەڵیکم بەهرە لێبرد. پاشان کاتی دەر کەوتنم بە منی کوت: ئەی ویشکەزاهید! بڕوانە ئەگەر ئەوەی کە داویانە بە هەموو ئەنبیا بیدەن بە تۆ، بڵێ تۆم دەوێ و جگە لە تۆم ناوێ. "

٢٤٣.

**بایەزید** کوتی " تۆبەی خەڵک لە گوناهەکانە و تۆبەی من لە لا اله الا الله. من بە حەرف و ئەندامەکان دەیڵێم و هەق بەدەر لە حەرف و ئەندامە. "



٢٤٤.

**بایەزید** کوتی " ئەگەر لە سەرەتای ئادەمەوە هەتا قیامەت هەموو خەڵک ببەخشی، مشتێک خاکت بەخشیوە و ئەگەر لە سەرەتای ئادەمەوە هەتا قیامەت هەموویان بسووتێنی مشتێک خاکت سووتاندووە. "

٢٤٥.

**بایەزید** کوتی " ناوەکان هەموو ناوی سفەتن و ئەڵڵا ناوی زاتە. ناو عەلامەتی ناسینی مانایە و مانا عەلامەتێکە کە بەو سفەت دەناسن و سفەت عەلامەتێکە کە بەو زات دەناسن. هەرکەس ئیقرار بە سفەت بکا و بە زات ئیقرار نەهێنێ موسڵمان نییە و هەرکەس بە زات ئیقرار بێنێ بەر لە سفەت موسڵمانی پێدەکوترێ. هۆیەکەی ئەوەیە کە ئەگەر کەسێک بڵێ لا اله الا الرحمن یا لا اله الا الرحیم و پاشان یەک یەکی ناوەکان بێنێ موسڵمان نابێ هەتا نەڵی لا اله الا الله و هەرکەس بەم ناوی تاکانە کە ئەڵڵایە ئیقرار بێنێ، ناوەکانی دیکەی دە دەروونی ئەو دایە و لەو ناوە هەموو ماناکان پەیدا دەبن و دەو ناوە دا وجوودی ناوەکان دەگونجێن و ئەو ناوە نیازی بە ناوی دیکە نییە. هۆیەکەی ئەوەیە کە خودای تەعالا بەو ناوە تاکانە کراوە و لە سەر خەڵک ڕەوا نییە بەڵام لە ناوەکانی دیکە دا دەگەڵ خەڵک شەریکە جگە لەو ناوە. ڕەوایە کە بە پیاوێک بڵێین عالیم و ڕەحیم و کەریم لە سەر ماناکانی ئەو ناوانە بەڵام ڕەوا نییە کە بە پیاوێک بڵێین ئەڵڵا چونکە ئەمە ناوی ئەوە.

" هەرکەس ئەڵڵا بە ناوێک لەم ناوانە بانگ بکا ئەو نەسیب و بەهرەیەکی لێ هەیە ئیللا ئەڵڵا. ماناکەی ئەوەیە کە هەرکەس

پەروەردگاری خۆی بە ڕەحمەتی وی بانگ بکا دەڵێ: یا ڕەحیم! و هەرکەسبە کەرەم بانگی بکا دەڵێ: یا کەریم! و هەرکەس بە جوود تەڵەبی بکا دەڵێ: یا جەواد! جا لە ژێر هەر ناوێک مانایەکە بەو نەسیبەی کە بۆ خەڵکە بانگی دەکا، چ بۆ ئەمری دونیا و چ بۆ ئەمری دین جگە لە ئەڵڵا کە ئەو بۆ وەحدانیەتی خودا بانگ دەکا و نەفس دەو یەکە دا نەسیبێکی نییە.

" هەرکەس لە خودای تەعالا عەتایەک داوا بکا ئەو بە ناوەکانی سفەت بانگ دەکا و هەرکەس کە زاتی خودا تەڵەب بکا ئەو با ناوی زات بانگ دەکا. "

.٢٤٦

**بایەزید** کوتی " ئەوم بە خۆم ناسی، فانی بووم. لە دوایی ئەوم بە ئەو ناسی و ژیانم دەست کەوت. "

.٢٤٧

**بایەزید** کوتی " خەڵک بەو دەڵێن و من لەو دەڵێم. "

.٢٤٨

**بایەزید** کوتی " هەرکەس بە عیلم بڕوانێتە خەڵک، دەبێتە دوژمنیان و هەرکەس بە هەقیقەت بڕوانێتە خەڵک دەیانبەخشێ. "

هەروەتر:

کوتی " هەرکەس لە خەڵکەوە بڕوانێتە خەڵک، دەبێتە دوژمنیان و هەرکەس لە خەڵکەوە بڕوانێتە خالەق، ڕەحمەتیان پێدێنێ. "



.٢٤٩

لێیانپرسی " پیاو کەی هەڵگری مانای عەبدایەتییە؟ "

کوتی " ئەودەم کە بۆ ئەو ویستێک نەبێ. "

پرسیان کە " ئەوە چۆن دەبێ؟ "

کوتی " ویست و ئاوات و شەهوەتی ئەو دە نێو مەحەببەتی پەروەردگارەکەی دابێ و هەرگیز ویستێکی پێشتر دە هیچ شتێک دا نابێ هەتا ئەودەم نەزانێ کە ویستی خودا و مەحەببەتی وی، دەو دا چیە؟ "

.٢٥٠

**بایەزید** کوتی " موئمین نەفسی نییە. " پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە " خودا لە موئمینان نەفسەکانی وانی کڕیوە - ان الله اشتری من المومنین انفسهم – هەرکەس نەفسی خۆی فرۆشتووە چلۆن خاوەن نەفسە. "

.٢٥١

سەبارەت بە ناوی ئەعزەم لە **بایەزید**یان پرسی، کوتی " کوتنی لا اله الا الله بە شەرتێک کە تۆ خۆت لەوێ نەبی. " و پاشان کوتی " لا اله الا الله وەها کە تۆ خۆت لەوێ بی. "

.٢٥٢

سەبارەت بە تەسەووف لە **بایەزید**یان پرسی، کوتی " تەسەووف سفەتی هەقە کە بەندە خۆی پێدادەپۆشێ. "

.٢٥٣

**بایەزید** کوتی " خودای تەعالا بەندەکانی خۆی بە هەندێک کار فەرمان دا و لە هەندێک کار مەنعی کردن و ئەوان ئیتاعەتیان کرد، لەبەر ئەوە خەلاتێکی لە خەلاتەکانی خۆی پێشکەش کردن و ئەوان بەو خەلاتانە خەریک بوون و من لە خودا جگە لە خودام ناوی. "

.٢٥٤

ڕۆژێک **بایەزید** بیستی کە پیاوێک دەڵێ " الله اکبر! "
پرسی کە " مانای الله اکبر چیە؟ "
پیاو کوتی " گەورەتر لە هەموو شتێک! "
**بایەزید** کوتی " وای بە تۆ! ئەوت چووک کردەوە. ئایا ئەو شتێکی دەگەڵە کە ئەو گەورەتر لەو بێ؟ "
جا ئەو پیاوە لە **بایەزیدی** پرسی کە " مانای الله اکبر چیە؟ "
**بایەزید** کوتی " گەورەتر لەوە کە قیاسی بکرێ دەگەڵ خەڵک یا دەگەڵ ئەوەی کە دە قیاس دا دەگونجێ یا بە هەست بکرێ ئەو هەست پێبکەی. "

.٢٥٥

کەسێک تانەی لە **بایەزید** دا. یەک لە لاینگرانی **بایەزید** ئەو قسەی بیستەوە و زەربەتێکی لەو کەسە دا. کاتێک خەبەرەکەی بە **بایەزید** گەیشت، کوتی " ئەگەر کەسێکی وەک وی نەبا، کێ ئەو زەربەتەی لێدەدا؟ "



.٢٥٦

**بایەزید** بە یەکێک لە شاگردەکانی فەرمان دا هەتا نانێکی بۆ بکڕێ و ئەو کڕی. کاتێک سەیری نانی کرد دیتی سووتاوە. فەرمانی دا هەتا بۆ خاوەنەکەی بەرێتەوە و کوتی " دەڵێی ئەوانە پێیانوایە ئێمە هەرچی بێ دەیخۆن. " فەرمانی پێدا هەتا باشترین و سپیترین نان وەربگرێ.

.٢٥٧

**بایەزید** کوتی " بەهەشت دوو جۆرە: جەننەتی نەعیم و جەننەتی مەعرەفەت. جەننەتی مەعرەفەت دایمییە و جەننەتی نەعیم موەققەت. "

.٢٥٨

یەکێک لە خوراسانەوە و کوتی " ئەهلی خوراسان سڵاویان بۆت هەیە. "
**بایەزید** کوتی " بە سەرۆکانی خوراسان بڵێ ئەگەر دەتوانن بگەڕێنەوە سەر ئەو فەنایەی کە لە سەرەتا دا بوون، دەنا بزانن کە ئەو بەرژەوەندییە شنەیەکە بە سەرتان دا دەشنێ. "

.٢٥٩

لە **بایەزید** دەگێڕنەوە کە:
لە ئەهلی زاهیر شکایەتی زۆر بوو و کوتی " ئەو ویشکەزاهیدانەی بەستام منیان پیر کرد، بریا ئەوانم نەبینیبا. "
هەروەتر کوتی " ئەی ویشکەزاهید یا وەها خۆ بنوێنە کە هەی یا وەها بە کە خۆ دەنوێنی. "

٢٦٠.

**بایەزید** کوتی " بیرم کردەوە کە نەفسی خۆم دوای مەرگ دە نێو گومبەزێکی کەسک لە سەر حەوا دابنێم، لە تیر و تانەی ویشکەزاهیدان ترسام کە بڵێن: بڕوانە ئەو مەغرووورە کە نەفسی خۆی وەها لێکردووە هەتا خۆ بنوێنێ. لەبەر ئەوە ئەو کارەم وەلانا و نەمکرد. "

٢٦١.

جارێک موعیزەی بۆ خۆی دەکرد و بە سەر خۆی دا دەیگوڕاند کە "ئەی مەنزڵگای هەر خراپەیەک! ژن کاتێک دە حەیزەوە بچێ بە سێ ڕۆژ یا بە دە ڕۆژان پاک دەبێتەوە و تۆ ئەی نەفس بیست سی ساڵە دە حەیزی دای و هێشتا پاک نەبوویەوە! کەی پاک دەبیەوە کە چون لە بەرابەر ئەو پاکە دا بوەستی، دەبێ پاک بی. "

٢٦٢.

لێیانپرسی کە " خودات چۆن ناسی؟ "

**بایەزید** بە پرسیارکەری کوت " ئەگەر ئەوت ناسیبا لە منت ئەو پرسیارە نەدەکرد و هەرکەس خودای نەناسیوە بە قسەی عارفیش نایناسێ و هەرکەس خوای ناسیوە، لە پرسینی بێنیازە. "

٢٦٣.

**بایەزید** کوتی " خودا بە کافرانی کوت: ئیمان بێنن! بە مونافقانی کوت: ئیخلاستان هەبێ! بە گوناهکارانی کوت: تۆبە بکەن! بە موحیبانی کوت: خۆشحاڵ بن! و بە عارفانی کوت: بڕوانن! "



٢٦٤.

**بایەزید** کوتی " هەق وەک هەتاو دەدرەوشێتەوە، کاتێک تێیبڕوانن بە یەقین دەگەن و هەرکەس بە دیتنی عەیان، لە بەیان بگەڕێ، زیانکارە.

--------------------

دە کتێبی تفسیر کشف الاسرار دا وەها هاتووە:

بایەزیدی بەستامی دەڵێ " ڕێگای هەق وەک هەتاوی تابانە، هەرکەس بینایی هەیە کە بڕوانێ بە یەقین و ئیمانە، لە سەر هەر گڵمەتێک و هەر زەڕڕەیەک لە زەڕڕەکانی بوونەوەران، لە سەر تاکانەیی هەق سەد هەزاران بەیانە. " (ب ١ ل ٤٣٤)

٢٦٥.

**بایەزید** دەیکوت " ئەی ئەو کەسەی کە هەموو شتت بە هیچ فرۆشتووە و ئەی کە کڕیوتە هیچ بە هەموو شتێک، دە تاعەتت تۆ دا ئەوەندە ئافەت هەیە کە نیازت بە کردەوەی خراپ نییە. "

٢٦٦.

**بایەزید** کوتی " هەرکەس لە دونیا زوهد بکاتە پیشەی خۆی، قەدری دونیای دە دڵی خۆی دا نیشان دەدا. "

٢٦٧.

ئەبوومووسای دەبیلی کوتی کە:

بە **بایەزید**یان کوت " تەوەککول چیە؟ "

**بایەزید** بە منی کوت " تۆ دەڵێی چی؟ "

کوتم " ئەسحابی ئێمە دەڵێن: تەوەککول ئەوەیە کە ئەگەر هەموو دڕندەکان و مارەکان لە چەپ و ڕاستی تۆ بن نابێ دڵت بلەرزێ. "

**بایەزید** کوتی " ئادی، لەوە نزیکە، بەڵام ئەگەر ئەهلی بەهەشت لە بەهەشت دە نێعمەت دان و ئەهلی دۆزەخ لە دۆزەخ دە عەزاب دان و تۆ دەو نێوە دا تەمیز و تۆفیرێک دابنێی، لە ئاڵقەی ئەهلی تەوەککول دەرکەوتووی. "

٢٦٨.

**بایەزید** کوتی " ئەگەر خەڵک من بناسن، مونکیر دەبن. "

یەک لە یاران پێیکوت " کەوایە تۆ مونکیری ئەوەی، ئیدی مانای مەعرەفەتی هەق چیە؟ "

**بایەزید** کوتی " هیچ هەقێک نییە مەگەر ئەوە کە دە من دا ساف بووبێتەوە. کەوایە قەوامی هەق من تەوسیف دەکا و هەقێک نییە مەگەر ئەوە کە من ئەو هەقەم. "

٢٦٩.

**بایەزید** کوتی " من، نە منم، من منم چونکە من، من – ئەوم و ئەو، من ئەو ئەو. "

٢٧٠.

ئەبوومووسا کوتی " **بایەزید** وەختایەک حاڵەت دەیگرت قسەیەکی دەردەبڕی کە بە یادگار بۆ ئێمە ماوەتەوە: دۆستایەتی ئەو دۆستایەتی من و دۆستایەتی من دۆستایەتی ئەو، ئەشقی ئەو ئەشقی من و ئەشقی من ئەشقی ئەو، مەحەببەتی ئەو مەحەببەتی من و مەحەببەتی من مەحەببەتی ئەو. "

هەروەتر کوتی " لافاوی ئەشق هات و هەمووی سووتاند، جا هەر ئەو تاکانەیە ماوە هەر ئەوجۆرەی کە یەک بوو چونکە ئەوە تاکانە. "



٢٧١.

**بایەزید** کوتی " هەرکەس موبتەلای وی بوو، هەرچی هەبوو بەوی بەخشی. "

٢٧٢.

**بایەزید** کوتی " هیچ شتێک لەوە باشتر بۆ بەندە نییە کە دەستبەتاڵ بێ، بێ هیچ شتێک: نە زاهید بوون، نە عابید بوون، نە زانست و نە هیچ شتێک لە شتەکان هەتا لە هەموو شت جێ بمێنێ کە چون جێ ماوە هەموو شت لە پشتی سەری وین. "

٢٧٣.

**بایەزید** کوتی " بیستوومە کە خودای تەعالا دەڵێ: هەرکەس لە هەموو هەڵبڕاو بێتە لای من، ژیانێکی پێدەبەخشم کە مەرگی تێدانەبێ و هەرکەس هەڵبڕاو لە هەموو بێتە لای من ملکێکی ئەبەدیی دەدەمێ و هەرکەس هەڵبڕاو لە خەڵک بێتە لای من، ویستی خۆم دەکەم بە ویستی ئەو. "

٢٧٤.

پیاوێک هاتە لای **بایەزید** و ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوە " ان بطش ربک لشدید. "

کوتی " سوێند بە ژیانی ئەو کە بطش-ی من لە بەطش-ی وی سەختترە. "

.٢٧٥

بە **بایەزیدیان** کوت " خەڵک لە ژێر ئاڵای مەحەممەد دان. "

**بایەزید** کوتی " سوێند بە خودا کە ژێر ئاڵای من گەورەتر لە ژێر ئاڵای مەحەممەدە. ژێر ئاڵای من لە نوورێکە کە ئادەمەکان و پەرییەکان، هەموو لە ژێر ئەو ئاڵایە دان دەگەڵ پێغەمبەران. "

.٢٧٦

بە **بایەزیدیان** کوت " بە چ شتێک مەعرەفەتت دەست کەوت؟ "

کوتی " بە لەشێکی ڕووت و زگێکی برسی. "

--------------------

دە کتێبی تفسیر کشف الاسرار دا هاتووە:

لە بایەزیدی بەستامییان پرسی " بە چ شتێک بەو مەقامە گەیشتی؟"

کوتی " بە لەشێکی ڕووت و زگێکی برسی و دڵێکی پڕ دەرد و گیانێکی پڕ لە حەسرەت!"

کوتیان " ڕەوایە ئەگەر کەسێک بێ پەیرەویی کردن لە ڕێگەی تەریقەت بەو مەقامە بگا؟"

کوتی " ڕەوایە، بەڵام دەستکەوتی بە قەرا سەفەرەکەی دەبێ و تێشووی بە قەرا حەوسەلەی. " (ب ١ ل ٤٠٦)

.٢٧٧

**بایەزید** کوتی " پێشکەوتنم لەوە و جێمانم لە نەفسی منەوەیە. " — [یانی] هەرکات نەفسی بینیوە جەبری بینیوە و کاتێک نەفسی خۆی ون کردووە، ئیختیاری بینیوە.



.٢٧٨

**بایەزید** کوتی " ئەسحابی وەجد شتێک لە حوزوور نەگەیشتن مەگەر ئەودەم کە لە حوزووری خۆیان غایب بوون و ئەوە من بووم کە ئەوانم لە حوزووری خۆیان ئاگادار دەکردەوە. ئەو هەرگیز غایب نەبوو مەگەر ئەوە کە من حازر بام و حازر نەدەبوو مەگەر ئەوە کە من غایب بووبام چونکە هیچ شتێک دەگەڵ دژی خۆی یەک ناگرێتەوە."

.٢٧٩

**بایەزید** کوتی " خودایە! ئەگەر دە پێشینەی عیلمی تۆ دا ئەوە هەیە کە کەسێک بە ئاگری دۆزەخ بسووتێنی، کەوایە لەشی من وەها پان بکەوە هەتا دۆزەخ جێگەی گونجانی کەسی دیکەی نەبێ.

.٢٨٠

لە **بایەزیدیان** پرسی کە " بۆ دە نوێژ دا دەستەکان هەڵدێنن؟ "

کوتی " سوننەتێکە لە سوننەتەکانی ڕەسووڵ بەڵام تۆ هەوڵ بدە کە دڵی خۆت بەرەو خودا هەڵبێنی کە ئەوە باشترە. "

.٢٨١

**بایەزید** کوتی " جارێک هەڵیانکێشام هەتا لە ئاستانەی وی وەستام. بە منی کوت: ئەی **بایەزید!** بەندەکانی من دەیانەوێ کە تۆ ببینن."

**بایەزید** کوتی " کوتم: ئەی عەزیزی من، من نامەوێ ئەوان ببینم. ئەگەر تۆ ئەمەت لە من دەوێ من توانایی دژایەتیی تۆم نییە. کەوایە من بە وەحدانیەتی خۆت بڕازێنەوە هەتا کاتێک خەڵک بڕواننە من بڵێن تۆمان بینیوە. هەتا تۆ بی و من لەوێ نەبم. "

**بایەزید** کوتی " جا وایکرد. منی ڕاگرت و ڕازاندیەوە و کوتی: بچۆ نێو خەڵکەوە. هەنگاوێکم لەوەوە بەرەو خەڵک هەڵگرت و کاتێک گەیشتمە هەنگاوی دووهەم لە هۆش چووم. دەنگ هات کە: دۆستی من بگەڕێننەوە کە ئەو تاقەتی دووریی ئێمەی نییە. "

٢٨٢.

**بایەزید** کوتی " ئەوەندە گریام کە پێکەنیم و ئەوەندە پێکەنیم کە وەهام لێهات کە نە پێبکەنم و نە بگریم. "

٢٨٣.

**بایەزید** کوتی " مەعرەفەتی عەوام و مەعرەفەتی خەواس و مەعرەفەتی خەواسی خەواس.

" مەعرەفەتی عەوام: مەعرەفەتی بەندایەتی و مەعرەفەتی ڕەببایەتی و مەعرەفەتی تاعەت و گوناهـ و مەعرەفەتی دوژمن و مەعرەفەتی نەفسە.

" مەعرەفەتی خەواس: مەعرەفەتی شکۆ و عەزەمەت و مەعرەفەتی ئیحسان و میننەت و مەعرەفەتی تۆفیقە.

" مەعرەفەتی خەواسی خەواس: مەعرەفەتی ئونس و موناجات و مەعرەفەتی لوتف و لوتف کردنەوە؛ پاشان مەعرەفەتی دڵ و پاشان مەعرەفەتی سیڕ. "



٢٨٤.

لە حوزووری **بایەزید** دا ئەو ئایەتەیان خوێندەوە " یوم نحشر المتقین الی الرحمن وفدا " **بایەزید** وە وەجد کەوت و شەیدا بوو و هەروا دەیکوت "هەرکەس لای ئەوە نیازی بەوە نییە کە حەشری بکەن چونکە هەمیشە هاونشینی ئەوە. "

٢٨٥.

**بایەزید** کوتی " کاتێک ئاگاداریی لە تەوحیدی پێبەخشیم، نەفسی خۆم تەڵاق دا و چوومە لای پەروەردگاری خۆم و هانام بۆ برد و کوتم: مەولای من! بە دوعا کەسێک بانگ دەکەم کە جگە لە تۆ کەسی بۆ نەماوە. کاتێک سیدقی دوعاکەی منی بینی و هیوابڕاوییم لە نەفس، یەکەم شتێک کە لە ئیجابەتی ئەو دوعایە پێمگەیشت ئەوە بوو کە نەفسی منی بە یەکجاریی سپاردە دەست فەرامۆشییەوە و خەڵک و بوونەوەرانی لە دڵی من خستە فەرامۆشییەوە. " **بایەزید** کوتی " لە هەموو خەفەتێک ڕزگارییم هات و بەبێ هیچ خەمێک دانیشتم. وڵات بە دوای وڵاتم دەبڕی و کاتێک دەگەیشتمە وێ، دەمکوت: هەستن تا بڕۆین. ئەوانم هەڵدەستاند و دەڕۆیشتم، هەتا چوومە لای ئەو. جا منی لە خۆ نزیک کردەوە و بەرەو خۆی ڕێی دام، ڕێگایەک نزیکتر لە ڕێگای ڕووح بەرەو لەش. پاشان کوتی: ئەی **بایەزید!** ئەوان هەموو، جگە لە تۆ، خەڵکی منن. من کوتم: کەوایە من تۆم و تۆ منی. "

٢٨٦.

**بایەزید** کوتی " سێ کەس بە سێ شت، پتر لە هەمووکەس لە هەق دە حیجاب دان: زاهید بە زوهدی خۆی و عابید بە عیبادەتی خۆی و عالیم بە عیلمی خۆی. " لە پاشان کوتی " بێچارە زاهید! زوهدی لە خۆ بەستووە و هاتۆتە مەیدانی زاهیدان. بریا کەممایەیی دونیای زانیبا و زانیبای لە چی زوهد دەکا و چ نرخێکی هەیە ئەوەی کە ئەو زوهدی لێدەکا و زانیبای کە پایگای ئەو لە نێو جەمعی زاهیدانی دونیا لە کوێیە.

" بەڵام عابید کەسێکە کە منەتی خودا لە سەر خۆی – لە تۆفیقی عیبادەت دا – پتر لە عیبادەتی خۆی دەبینێ وەها کە عیبادەتەکەی دەو منەتە دا نوقم دەبێ.

" بەڵام عالیم، بریا زانیبای ئەوەیکە خودا لە عیلم ئاشکرای کردووە دێڕێکە لە لەوحی مەحفووز، ئێستا چ مایەیەک ئەو عالیمە لەو عیلمە دەزانێ و لەوەندە کە دەیزانێ چەندە عەمەلی پێکردووە؟ "

پاشان **بایەزید** کوتی " عالیم ئەوەیە کە عیلمی وی خودایە. لەو وەردەگرێ هەرکات بخوازێ و هەرجۆر بیەوێ، بێ هیچ لە بەر کردن و نووسراوەیەک. "

٢٨٧.

یەک لە گەورەپیاوان هاتە لای **بایەزید** و پێیکوت " ئەی **بایەزید**! مڵکی هەر دوو جەهانیان داوە بە من! "

**بایەزید** کوتی " مڵکی دوو جەهان خۆی چیە جگە لە دوو سەرای ئیبلیس."



٢٨٨.

لە **بایەزیدیان** پرسی " خودا ئەو خەڵکەی لەبەرچی خوڵقاندووە؟ "

کوتی " هەتا قودرەتی خۆی ئاشکرا بکا. ڕۆژیی داونێ هەتا هەبوونی خۆی ئاشکرا بکا. ئەوان دەمرێنێ هەتا قەهری خۆی ئاشکرا بکا. زیندوویان دەکاتەوە هەتا عەزەمەتی خۆی ئاشکرا بکا. دەگەڵ ئەوان موحاسبەی دەکا هەتا عەدلی خۆی ئاشکرا بکا. موئمینان دەباتە بەهەشت هەتا ڕەحمەتی خۆی ئاشکرا بکا. "

٢٨٩. **هەروەتر:**

کوتی " عارف هەرگیز لە شتێک شادمان نابێ و لە هیچ شتێک هەراسان. "

٢٩٠.

پیاوێک بە **بایەزیدی** کوت " بیستوومە کە ناوی ئەعزەم لای تۆیە، دەمەوێ کە فێرم بکەی. "

**بایەزید** کوتی " ناوی ئەعزەمی ئیلاهی حەدد و مەرزی نییە، تۆ دڵی خۆت بۆ تاکانەیی ئەو پاک بکەوە کە وەهات کرد هەر ناوێک کە پێتخۆشە هەڵیبژێرە. بەوە تۆ دەتوانی لە مەشریق بچیە مەغریب و بگەڕێیەوە و بیگێڕیەوە. "

پیاو کوتی " سوبحانەڵڵا! ئەوە دەکرێ کە بەشەر بە سەعاتێک لە مەشریقەوە بچێتە مەغریب و بگەڕێتەوە و بیگێڕێتەوە؟ "

**بایەزید** کوتی " ئادی و ئەمە هیچ خەتەرێکی نییە کە پیاوێک بە ناوی ئەعزەمی ئیلاهی ئاسمانەکان و زەمینەکان بنێتە ژێر پێی چونکە هەرچی کە غەیری خودایە لە ژێر هەنگاوەکانی ئەو دادەبێ و ئەو بە پێیەکانی خۆی بۆ هەرکوێی پێخۆش بێ دەچێ. "

ئەو پیاوە کوتی " ئەوە چ مەقامێکە؟ "

**بایەزید** کوتی " ئەو مەقامە سفەتی نییە بەڵام حەکایەتەکەی وەک حەکایەتی ئاوێنەیەکە شەش سوو کاتێک خودا بیەوێ سەیری خەڵکی خۆی بکا دەڕوانێتە ئەو پیاوەی کە ئاوێنەی وییە، جا خەڵکی خۆی تێدادەبینێ و بە تەدبیری کارەکەیان خەریک دەبێ. "

٢٩١.

ئەبووحەفس هاتە لای **بایەزید** و پێیکوت " ئەی **بایەزید!** هەردەمەی شتێک سەبارەت بە تۆ دەبیسم و من ئینکاری دەکەم. "

**بایەزید** کوتی " قسە لە من بە پیی کات دەدەڵێ و هەرکەس بە پێی ئەو حاڵەی کە تێیدا وەریدەگرێ، ئەودەم بە هی منی دادەنێ. "

٢٩٢. دەگێڕنەوە:

جەماعەتێک لە خەڵک لێی کۆ بوونەوە، **بایەزید** کوتی " یا ڕەب لە تۆم داوا کرد خۆت بە خۆت لەوان مەکە بە حیجاب، ئێستا منت کردۆتە حیجابی خۆت لەوان. "

**٢٩٣. یارانی بایەزید دەگێڕنەوە کە:**

دەیکوت " سەرەتای کاری من ئەوە بوو کە هەقتەعالا ڕۆژگارێکی درێژ منی لە بەر دەرگای عولەما و قسەی شاگردان ڕاگرت، کاتێک لە علومی جۆراوجۆر پێش کەوتم، نەفسی من بە منی کوت کە: تۆ زانا و ئاگادار بووی و زانا و ئاگادار سەرووترین پلەیە. جا هەقتەعالا ڕێی دام هەتا ئاپوورەی عالیمان و عارفانم ببینم. جێ پێیەکم بۆ خۆم دە نێو ئەوان دا نەبینی. جا هەڵوەشامەوە و گەڕامەوە و بە هەق نەگەیشتم.



" کوتم: عیلم و مەعرەفەت، بێ هەقیقەت حوججەتە و پێموابوو کە هەقیقەت دە عیلم و ئیجتهاد دایە. جا هەقتەعالا ڕۆژگارێکی درێژ منی دەگەڵ نوێژکەرانی جەماعەت و ئەهلی میحراب ڕاگرت. وەها کە هەرگیز تەکبیری یەکەم دەگەڵ ئیمام لە من قەزا نەبوو. جا هەقتەعالا ڕێی دام و نوێژکەران و ڕکووعبەران و سوجدەبەرانم لە بەر دەرگا بینی و جێ پێیەکم بۆ خۆم دە نێو ئەوان دا نەبینی. جا هەڵوەشامەوە و گەڕامەوە و بە هەق نەگەیشتم.

" جا ڕۆژگارێکی درێژ منی دەگەڵ بەڕۆژووبوان ڕاگرت. پاشان ڕێی دام و ئاپوورەی بەڕۆژووبوانی برسی – کە ڕۆژووی ڕۆژیان لە نوێژی شەو بەستبۆوە - لە بەر دەرگا بینی و بۆ خۆم دە نێو ئەوان دا جێ پێیەکم نەبینی. جا گەڕامەوە و بە هەقتەعالا نەگەیشتم.

" جا هەقتەعالا ڕۆژگارێکی درێژ منی دەگەڵ زیارەتکەرانی ماڵی خۆی ڕاگرت. پاشان ڕێی دام هەتا ئاپوورەی لەبەیکبێژان و ئیحرامکەرانی نێو دۆڵ و دەرەکان [کە وەک] ڕووباری خوڕێن و ڕەوان بەرەو ئەو بەڕیوەن، بینی و جێ پێیەکم بۆ خۆم دە نێو ئەوان دا نەبینی. جا هەڵوەشامەوە و گەڕامەوە و بە هەقتەعالا نەگەیشتم.

" جا هەتەعالا ڕۆژگارێکی درێژ منی دەگەڵ موجاهیدان ڕاگرت و دەگەڵیان لە ئاست دوژمنانی وی شەمشیری هەڵکێشراو بووم. پاشان ڕێی دام و پێینواندم ئاپوورەی ئەو موجاهیدانەی کە قاتڵانی دوژمنانی وی بوون و خۆیان لە پێشگای ئەو کوژرابوون و دە خوێنی برینی خۆیان گەوزیبوون، جێ پێیەکم دە نێوان ئەوان دا بۆ خۆم نەبینی. جا هەڵوەشامەوە و گەڕامەوە و بە هەق نەگەیشتم.

" جا کوتم: ئیلاهی! ببوورە لە من و لە حەیرەتی من! ئەو بەندەیەت بگەیەنە مەقامێک کە لە تۆ نزیک بمەوە و هیچکەس داخوازی ئەو

مەقامە دەگەڵ من نەبێ و لەو مەقامە من زەحمەت نەدەن. من لە ئەحواڵی ئەو کەسانەی کە بەر لە من گەیشتبوونە لای تۆ ئاگادار بووم، بینیم من تاقەتی تیکەڵ بوون بەوانم نییە.

" جا هەقتەعالا بانگی کردم کە: ئەی **بایەزید!** هیچکەس لە داخوازانی نزیکیی لە من ئەو نزیکایەتییەیان دەست ناکەوێ. شتێک بۆ من بێنە کە من خۆم نەمبێ. کوتم: ئیلاهی! چیە ئەوەی کە تۆ نیتە و تۆ ئەو کەسە لە خۆت نزیک دەکەیەوە کە ئەو بۆ تۆ بێنێ؟ هەقتەعالا کوتی: ئەی **بایەزید** من فەقر و نەدارییم نییە. هەرکەس بەو وەسیلەیە داخوازی نزیکیی لە من بێ ئەو نزیک دەکەمەوە. کوتم: خودایە! حاڵەتی خاوەنانی فەقر و فاقەم پێبنوێنە.

" جا خودا حاڵەتی خاوەنانی فەقر و فاقەی پێنواندم. بینیم تاقمێکی کەمن و لەوێ هیچ قەرەباڵغیی و داخوازییەکم نەبینی و لە دەرگای هەق هاوار و بانگی وانم نەبیست. جا بەڵێنم دەگەڵ هەقتەعالا بەست کە هیچ شتێک جگە لە فەقر و نەداریی هەڵنەبژێرم.

" ئێستا ئەمە منم، لەو ڕۆژگارەوە کە ئەو بەڵێنەم داوە ساعەتێک نییە کە کەرامەتێکی نوێم لەو پێنەگا. جا کوتم: ئیلاهی! ئەوە شتێکە کە تۆ منت لە نێوان ئەو خەڵکە تایبەت کردووە. کوتی: ئەوە کەرامەتێکە کە تێیناگەن مەگەر ئەو کەسەی کە فەقر و نەداریی هەڵبژاردووە و بەو سوکنایی دێ و خووی پێگرتووە. "



٢٩٤.

**بایەزید** کوتی " هەرکەس خودای ناسی حەیران ماوە و زمانی لە قسە وەستا. "

--------------------

حەدیسێک هەیە لە مەحەممەد کە دەڵێ: من عرف الله کل لسانە (هەرکەس خودای ناسی زمانی بەسترا)

٢٩٥.

کوتی " بەهەشت حیجابی ئەکبەرە. چونکە ئەهلی بەهەشت بە بەهەشت ئارامیان گرتووە و هەرکەس جگە لە هەق، بە شتێک ئارام بگرێ، دە حیجاب دایە. "

٢٩٦.

**بایەزید** کاتی تەکبیر دەیکوت " هەموو پادشاکان دەرگای سەرای خۆیان داخستووە و دەرگای سەرای تۆ، بۆ ئەو کەسەی کە تۆ بانگ بکا، ئاوەڵەیە یا ئەڵڵا! "

هەروەتر تەسبێحەکەی ئەمە بوو " سبحان من علا فتعالی، سبحان العلی الاعلی دون دنو الادنی، سبحان خالق النور، شکرا لخالق النور، سبحان خالق نور، حکما لخالق النور، سبحان خالق النور، عدلا لخالق النور، سبحان خالق النور و بحمده، سبحان خالق النور عز و جل جلاله. "

٢٩٧.

**بایەزید** کوتی " دە جەبەرووت دا غەیب بووم و دە دەریاکانی مەلەکووت دا بینم لێدا و دە حیجابەکانی لاهووت دا هەتا عەرش چووم و عەرشم بەتاڵ بینی. نەفسم تێگەیشت و کوتم: ئەی گەورەی من لە کوێ لێتبگەڕێم؟ جا پەردە داکەوت و بینیم کە من منم، کەوایە من منم. "

٢٩٨.

سەبارەت بە دەرەجەی عارف لە **بایەزید** پرسیاریان کرد، کوتی " لێرە دەرەجەیەک نییە. گەورەترین فایدەی عارف وجوودی ئەوە. "

٢٩٩.

**بایەزید** کوتی " نیشانی عارف ئەوەیە کە: تەعامەکەی شتێکە کە دەستی بکەوێ و ماڵەکەی جێگەیەکە کە بیگاتێ و خەریک بوونی بە پەروەردگارەکەی. "

٣٠٠.

**بایەزید** کوتی " کاتێک دۆستایەتی خودا بێ بە سەر هەموو شتێک دا زاڵ دەبێ؛ نە شیرینایی دونیا و نە شیرینایی ئاخیرەت. شیرینایی، شیرینایی ڕەحمانە. "

٣٠١.

**بایەزید** کوتی " خودام بە خودا ناسی و جگە لەوم بە ڕووناکی ئەو ناسی."



٣٠٢.

**بایەزید** کوتی " کەمترین شتێک کە لە سەر عارف واجبە ئەمەیە کە هەرچی هەیە بیدا بە ئەو. "

٣٠٣.

**بایەزید** کوتی " عارف سەرتر لەو شتەیە کە دەیڵێ و عالیم خوارترە لەوەی دەیڵێ. عارف بە هیچ شادمان نابێ و لە هیچ هەراسان نابێ. عارف هەمیشە دەڕوانێتە پەروەردگاری خۆی و عالیم دەڕوانێتە نەفسی خۆی. "

٣٠٤.

**بایەزید** کوتی " هیممەتی زاهید بەستە بەوەیە کە دەیخوا و هیممەتی عارف ئەوەیە کە چ ئارەزوویەکی هەبێ. "

٣٠٥.

**بایەزید** کوتی " زاهید دەڵێ: من چ بکەم؟ و عارف دەڵێ: ئەو چ دەکا؟ "

٣٠٦.

**بایەزید** کوتی " ئارەزووی زاهید دە دونیا دا کەراماتە و دە ئاخیرەت دا مەقامات. ئارەزووی عارف دەو دونیایە دا بەقای ئیمانە و لەو جەهان لێبوردن. " یانی لێبوردن بۆ خەڵک.

٣٠٧.

**بایەزید** بە ئەبوومووسای دەبیلی کە شاگردی عبدولڕەحیم بوو، کوت "باشترین قسەیەک کە لە سیاحەبی خۆت – یانی عەبدولڕەحیم – بیستووە چیە؟ "

کوتی " بیستم کە کوتی: پەروای ئەوەت نەبێ کە پاڵت وە گیانداریکی دڕەوە داوە یا وە نازباڵنجێک. "

**بایەزید** کوتی " نە سیاحەبی ئێوە و نە ئێمە هیچکەس کاریکی نەکردووە هەتا پاڵ وە هەقەوە بدا وەها کە جگە لە خودا هیچ نەبینێ. "

٣٠٨.

**بایەزید کوتی " سۆفی منداڵانن دە داوێنی هەق دا. "**

--------------------

ئەو قسە بە هی شیبلی داندراوە کە دەڵێ " سۆفیان منداڵانن لە پەنا لوتفی هەق " بایەزید بە گشتی وشەی سۆفی بە کار ناهێنێ.

٣٠٩.

**بایەزید** کوتی " هەقتەعالا ڕوانیە هەموو دڵەکانی عالەم و بەتاڵ لە خۆی بینی مەگەر دڵی من کە لە خۆی پڕ بینی. جا بە ڕێزەوە بانگی کردم و کوتی: هەموو عالەم بەندەی منن جگە لە تۆ. "

٣١٠.

**بایەزید** کوتی " خودایا! ئەو خەڵکەت خولقاندووە بێ ئەوەی کە بزانن و ئەمانەتی خۆت دە ملی کردوون بێ ئەوەی کە بیانەوێ، ئەگەر تۆ یارمەتیان نەدەی، کێ یارمەتیان بدا. "



٣١١.

**بایەزید** کوتی " لای ئاشقان، حەز لە بەهەشت نییە، چونکە ئەهلی ئەشق لەبەر ئەشقی خۆیان، لە بەهەشت دە حیجاب دان. "

٣١٢.

**بایەزید** کوتی " خودام بە هۆی خوداوە ناسی و ئەوەی کە غەیری وییە بە ڕووناکایی وی ناسی. "

٣١٣.

قەومێک لە بەسرە بۆ بارانە وە دەر کەوتن و یەکێک دەو نێوە دا هەستا و کوتی " خودایە بە هەقی ئەو سەرە و ئەوەی کە تێیدایە ئێمە تێراو بکە! " دەستبەجێ لە ئاسمان هەروەک زارکی مەشکە باران دایگرت. پیاوەکە چۆوە سەرای خۆی. یەک لەوان کە ئەوەی بینیبوو کوتی " دەبێ بە شوێنی دا بچم و بزانم کێیە؟ " جا بە دوای دا چوو و گەیشتەوە سەری و لێیپرسی، کوتی " من بە چاوی خۆم **بایەزیدم** لە بەستام بینیبوو، بۆیە کوتم بە هەقی ئەو سەرە و ئەوەی کە تێیدایە. "

پیاوەکە کوتی " **بایەزید** لە بەستام هاوسای منە. "

ئەو پیاوەی کە دوعای بارانەی کردبوو، کوتی " تۆ لە من داوای بارانە دەکەی دە حاڵێک دا خۆت هاوسای وی؟ تۆ لە من بەو نزیکتری. "

--------------------

مەتنەکە هەندێک تێکەڵ پێکەڵە و خۆم هەندێکم ڕێکوپێک کردووە. هەروەتر دە کتێبی مناقب العارفین دا ئەو ڕەوایەتە وەها هاتووە:

ڕۆژێک حەزرەتی مەولانا ڕەوایەتی فەرموو کە " لە شارێک ویشکەساڵیی بوو و گەلێک ڕۆژوویان دەگرت، قوربانیان دەکرد و نوێژیان بە جێ دێنا و لە حەزرەتی هەقتەعالا

دەپاڕانەوە هەتا حەوت ڕۆژان وەهایان کرد، ئەسڵەن باران نەباری و دڵۆپێک لە سەرەوە نەتکا. خەڵک تەواو بێچارە و پەرێشان ڕێککەوتن کە سبەی وەختایەک دەروازەی شار بکەنەوە لە بەر دەرگا چاومان بە هەر غەریبێک بکەوێ، ئەو بۆ شەفاعەت دەبەینە حەزرەتی هەق هەتا دوعا بکا، کە دوعای غەریب ئیجابەت دەکرێ کە فەرموودەی ڕەسووڵە. کە لە دەروازەی شار دەرکەوتن، دەروێشێکی غەریبیان دیتەوە کە لە بەستامەوە هاتبوو، کوتیان: ئەی دەروێش! تۆ لەم شارە غەریبی و لە هەق ئێمە دا بێغەرەزی و بۆ مووسا ئەمر هاتووە کە من بە زارێک بانگ بکە بەو زارە گوناهی نەکردبێ و ئەو زارە لە هەق ئێمە دا، زاری تۆیە، ئێستا دوعایەک بکە بەشکەم هەقتەعالا مەرحەمەت بفەرموێ دوعای تۆ قەبووڵ بکا و ئیجابەتی بفەرموێ. دەروێشی غەریب چوو سەر مینبەر... کوتی : یا رەبەلعالەمین! تەواوی عالەمیان و ئادەمیان هی تۆن و جگە لە تۆ کەسیان نییە ... بە هەقی هەر دوو چاوی من کە بارانێک بنێرە و تینوانی خۆت ئاو بدە. دەستبەجێ هەورێکی عەزیم دەرکەوت و عالەمی نوقمی سێڵاو و نم کرد، چەند ڕۆژێک، شەو و ڕۆژ باری. تەواوی ئەکابیری ئەو شارە خۆشیان ویست و چلۆنایەتی حاڵیان لێپرسی کە: چاوەکانی تۆ لای هەق چ فەزیلەتێکی هەیە کە کردتە شەفیع؟ کوتی: هەرچەندە روانیمە وجوودی خۆم هیچ شتێکم دە خۆم دا نەبینی کە لای هەق لایق بێ؛ بینیم کە بەم چاوە زعیفانەی خۆم دوو کەڕەت ڕووی مەبارەکی بایەزیدم بینیوە و جەمالی ئەوم موشاهیدە کردووە و ئەوەم بۆ شەفاعەت هێنا هەتا مەقسوودی ئێوە حاسڵ بوو. " (ل ٤٩١)

**٣١٤. هەروەتر:**

کوتی " زاهیدی ڕاستەقینە ئەوەیە کە ئەگەر لێبڕوانی هەیبەتی وی تۆ دابگرێ و کاتێک لێی جیا بیەوە لێت هاسان بێ و عارف ئەوەیەکە ئەگەر لێبڕوانی هەیبەتی وی تۆ دابگرێ و کاتێک لیی جیا بیەوە هەروا دەو هەیبەتە دابی. "



**٣١٥. هەروەتر:**

کوتی " ئەو کەسەی کە بە سەر ئاو دا دەڕوا سەیر نییە. خودای خەڵقاوی زۆرن کە بە سەر ئاو دا دەڕۆن و لای خودا قەدرێکی وەهایان نییە. "

.٣١٦

لە **بایەزیدیان** پرسی لە سەر قسەی خودا " انالله "، کوتی " ئیقرارێکە لە بەرابەر خودا کە ملک هی ئەوە و انا الیه راجعون ئیقرارە بە زەرەری نەفس و بە قازانجی ملک. "

.٣١٧

ئەبوومووسای دەبیلی کوتی " بە **بایەزیدم** کوت فایدەیەکم پێببەخشە هەتا دەگەڵ خۆمی بەرم. "

کوتی " ئەی ئەبوومووسا! بزانە کە فایدەی مەخلووق فایدە نییە! " بەڵام بۆی گێڕامەوە کە " دایکم کوتی: ئەودەم کە زگم بە تۆ پڕ بوو هەرکات کاسەیەک چێشتی حەڵاڵم لە پێش با دەستم پێیدەگەیشت و ئەگەر چێشتی حەرام با دەستم نەیدەگەیشت. ئەوە بۆ فایدە وەرگرە و بڕۆ. "

ئەبوومووسا کوتی " وەهام کرد و گەڕامەوە. "

.٣١٨

**بایەزید** کوتی " خودایە! هەرکەس کە خراپەی دەگەڵ کردووم، نێعمەتی خۆتی تێبکە وەها کە کرێوە، بەفر دە نێو دۆڵەکان دەکا و دەپەستێوێ. "

.٣١٩
**بایەزید** کوتی " ئەم حەدیسە - یانی قسەی خودا – هەروەک بارینی بەفرە دە هاوین دا، وجوودی غەریبە و بەقای لەو غەریبتر. "

.٣٢٠
لە **بایەزید** دەگێڕنەوە کە:
ڕۆژێک بە ئەسحابی خۆی کوت " ئەورۆ بەیانی هەستام و ویستم هەتا زیکری خودای تەعالا بکەم، نەمتوانی. هۆیەکەی ئەوە بوو کە جنێوێک کە بە منداڵی دابووم وە بیرم هاتەوە. بە خۆم کوت بە زمانێک کە وەها شتێکی دەربڕیوە و وەها قسەیەکی کوتووە، چلۆن یادی ئەو بکەم. "

.٣٢١
**بایەزید** کوتی " ئەگەر ئوستادێک شاگردەکەی بە کارێک لە کارەکانی دونیا فەرمان بدا و بەڕێی بکا و ئەو لە ڕێ دا بانگی نوێژی مزگەوتێک لە مزگەوتەکانی گوێ لێبێ و بڵێ: لە پێشدا دەچمە مزگەوت و نوێژ دەکەم و پاشان بە شوێن کارەکە دا دەڕۆم کە ئوستاد بە شوێنی دا ناردووم، دە چاڵێک کەوتووە کە قووڵایی مەعلووم نییە - یانی بۆ ئەو چاڵە بنێک نییە."

.٣٢٢
**بایەزید** بە ئەبوومووسای کوت " لە تەوەککول هەر ئەوەندە بۆ تۆ بەسە کە: یاوەرێک جگە لەو بۆ خۆت نەبینی و بۆ ڕۆژییت خەزێنەدارێک جگە لەو نەزانی و بۆ عەمەلی خۆت شاهیدێک جگە لەو نەناسی. "



.٣٢٣
لە **بایەزید** دەگێڕنەوە کە:
کوتی " مووسا ویستی هەتا خودا ببینێ و من نەمەویست؛ ئەوە خودا بوو کە دەیەویست من ببینێ. "

.٣٢٤
لە هەندێک لە پیرەکانم بیست کە دەیانگێڕاوە کە:
**بایەزیدی** بەستامی لە سەرەتای کارەکەی، تەمای دیداری پیاوێکی ئەهلی گرت و حەوتسەد فەرسەخ ڕێی بڕی. کاتێک گەیشتێ، ئەوی قەڵەو بینی. لە چوونە لای پەشیمان بۆوە. پیاو ئەو بیرەی **بایەزیدی** بۆ دەرکەوت، کوتی " ئەی **بایەزید!** حەوتسەد فەرسەخ ڕێگا بڕینی خۆت مەفەوتێنە، ئەم قەڵەویەی من هی شادیی لەوە. "

.٣٢٥
شێخ ئیسحاقی هەرویی جاری ئەووەڵ کە هاتبوو زیارەتی شێخ لە وەختی گەڕانەوە دا بە ئەبوو مووسای خادمی کوت کە " ئەم زیارەتەی کە من کردم بە سەد حەجی پیادەی مەقبوول نادەم، چونکە سەوابی حەج نەهایەتێکی هەیە و ئەمە نەهایەتی نییە. "

--------------------

دە کتێبی نورالعلوم دا وەها هاتووە:

گەورەیەک هاتە لای بوویەزید و زیارەتی کرد. کاتێک هاتە دەر بە مریدێک لە مریدانی شێخی کوت " ئەم زیارەتەم بە شێست حەجی فەرزنەکراو قیاس کرد. " جارێکی دیکە هاتە زیارەت و بەو مریدەی کوت کە " ئەو قسەی منت بە خواجە کوت؟ " کوتی " نا! " پێیخۆش بوو و کوتی " ئەو قسەی من غەلەت بوو کە بە شێست حەجم قیاس کرد. ناکرێ دیداری وەلی خودا قیاس بکەی. " (ل ٨٣)

۳۲٦.

پرسیان کە " دەبیسین کە تۆ بە سەعاتێک لە مەشریقەوە دەچیە مەغریب؟"

کوتی " ئەوە هەیە بەڵام ئەوە دەبێتە هۆی بایی بوونی موئمین، پیاوی جەوهەریی بەوکەسە دەڵێن کە وەختایەک هەتاوی جەماڵی دەربکەوێ مەشریق و مەغریب بێنە خزمەتی هەتا ئەو جۆرەی کە بخوازێ تەسەرووفیان تێدابکا. "

**۳۲۷. دەگێڕنەوە کە:**

قەومێک دەڵێن کە " مفتاحی بەهەشت کەلیمەی لا اله الا الله یە. "

کوتی " بەڵێ و کلیلی بێ ددانە دەرگا ناکاتەوە و ددانەی ئەم کلیلە چوار شتە: زمانێک لە درۆ و غەیبەت دوور، دڵێک لە مەکر و خیانەت ساف، زگێک لە حەرام و شوبهەت بەتاڵ و عەمەلێک لە هەوا و بیدعەت پاک.

۳۲۸.

لە نیشانەکانی عارفانانیان پرسی. کوتی " ان الملوک اذا دخلوا قریة افسدوها و جعلوا اعزة اهلها اذلة و کذلک یفعلون. – پادشاکان وەختایەک بچنە مەنزڵێک ئەو خراپ دەکەن و عەزیزەکان زەلیل دەکەن. یانی مەعرەفەتی ئەم پادشایە ئەگەر بگاتە دڵێک بێقەرار و نائارامی دەکا و هەوا و نەفسی ئەو کە پێشتر میر بوون ئەسیری دەکا و سەڵتەنەت دەسپێرێتە دڵ و دەمار لە خێڵی شەیتان دەردێنێ و ئەو دەخاتە ژێر حیمایەتی خۆی هەتا هیچکەس بە دەورەی دا نەخولێتەوە



و ئەو ڕەقەمە دەخاتە سەر چارەنووسی ئەو کە: لیس علی الخراب خراج - گوندی خراپ خەراجی لە سەر نییە. "

--------------------

دە کتێبی اللمع فی التصوف دا وەها هاتووە:

سەبارەت بە مەعرەفەت لە بایەزیدیان پرسی. ئەو ئیشارەی بە ئایەیەکی قورئان کرد "پادشاکان وەختایەک بچنە مەنزڵێک ئەو خراپ دەکەن و عەزیزەکان زەلیل دەکەن. " کە مەبەستی بایەزید ئەوەیە کە ڕەوشتی پادشایان لە چوونە نێو شار و گوندەکان ئەوەیە کە خەڵکی شار دەکەنە بەندە و زەلیل و هیچکەس ناتوانی هیچ کارێک بکا مەگەر بە فەرمانی پادشا. مەعرەفەتیش وەهایە کە بچێتە نێو دڵێکەوە هیچی تێداناهێڵێتەوە و هەموویان لە دڵ دەردەخا و هەرچی دە دڵ دا بجووڵێتەوە مەعرەفەت دەیسووتێنێ. (ل ۱۳۸)

**۳۲۹. دەگێڕنەوە کە:**

دوای وەفاتی، شێخیان دە خەو دا بینی، پرسیان کە " حاڵی تۆ دەگەڵ نەکیر و مونکیر چۆن بوو؟ "

کوتی " کاتێک پرسیاریان کرد، کوتم: مەقسوودی ئێوە لەم پرسیارە پێکنایە، بگەڕێنەوە و لەو بپرسن کە من بۆ وی کێم؟ ئەگەر سەد جار من بڵێم کە خودای من ئەوە هەتا ئەو من بە بەندەی خۆی دانەنێ بۆ ئێوە و بۆ من فایدەیەکی نابێ. "

**۳۳۰. هەروەتر:**

کوتی " هەرکەس دونیا لە ئاست ئاخیرەت هەڵبژێرێ، جەهلی ئەو بە سەر عیلمی دا زاڵ دەبێ و پەردەی گوناهەکانی ئەو ڕووی تاعەتەکانی دادەپۆشێ... و هەرکەس ئاخیرەت لە ئاست دونیا هەڵبژێرێ، خامۆشیی بە سەر گفتی دا زاڵ دەبێ و مەحەببەت ڕوو دە دڵی دەنێ. "

**۳۳۱. هەروەتر:**

کوتی " دڵی عارف هەرگیز لەو شکایەت ناکا و ئەگەر هەر ڕۆژەی هەزار برین وە گیانی بکەوێ هیوابڕاویی تێداپێکناهێنێ. "

**۳۳۲. هەروەتر:**

کوتی " مەرکەبی تۆ نەفسی تۆیە. ئەگەر لە ڕێگا دا بە ئارەزووی خۆی دابنێی دەخەوێ و هەڵدەستێ، تۆ لە ڕێگا وە پاش دەکەوی و لە ڕەفیقان مەحرووم دەبی و ناگەیە مەنزڵ. "

**۳۳۳. هەروەتر:**

کوتی " ئاخیرەت هی خەواسە و دونیا هی عەوام. هەرکەس کە دەیەوێ لە خەواس بێ بڵێ دەست لە شەریکایەتی عەوام هەڵبگرە و بە دەوری دونیا دا مەگەڕە کە دونیا ئاوێنەی ئاخیرەتە. هەرکەس لێپروانی و ئاخیرەتی بینی ڕزگاریی هاتووە و هەرکەس بەو مەشغووڵ بێ دەفەوتێ و ئاوێنەکەی ژەنگار دەگرێ. "

**۳۳٤. هەروەتر:**

شێخ، ئەبوومووسای وەسیەت کرد... فەرمووی " ئەی با مووسا! وەسیەتت پێدەکەم کە هەتا زیندووی ڕوو لە هەق وەرمەگێڕە و لە هەموو حاڵێک دا بە تەواوەتی خەریکی خزمەتی هەقتەعالا بە و بە یەقین بزانە کە چارەنووسی خەڵک لە دەست دەستەڵاتی خودای تەعالا دایە و لە پەیمانی خودای تەعالا لە سەر هەر دەست وپێیەک هەزار بەندی پێوەیە و بێشک ئەو دەبینی و لە پیش وی ڕادەوەستی و خیتابی وی دەبیسی و



خیتابی خودای تەعالا دەبێ جوابێک بدەیەوە و ئەویش جگە لە سەواب شیاو نییە. کەوایە ئێستا کارەکەت پێکبێنە و لە شۆرەکات تۆو دامەچێنە و غافڵ دامەنیشە خۆ بۆ مەرگ تەیار بکە کە ڕێگا دژوارە. تێشووی قیامەت تەقوایە بە ماڵ و نێعمەت نەجات پێکنایە. لە خەوی غەفڵەت هەستە. قسەی خودای تەعالا بە جیدد ببیسە و کوێخایی بدەوە بە هەق. دڵ لە بەندی بەیانی و شێو دەربکێشە. ملازمی زیکری هەق بە. کەمەری خزمەت لە میان ببەستە. هیچکەس جگە لە هەق ئیختیار مەکە. گومانی باش لە خودای تەعالا بکە کە هەقتەعالا بە قەرا گومانیان دەگەڵ بەندەکان دەجووڵێتەوە. لە سەر بەڵای هەق سێبوور بە و ڕازی بە قەزای ئەو. هیوات بە ڕەحمەتی وی هەبێ. دڵنیابە لە وەعدەی هەقتەعالا کە هەقتەعالا صادق ولوعد –ە. لە هەڕەشەی وی بترسە کە جەببارە. تەوەککول بەو بکە کە قەت نامرێ. یاریی لەوە بخوازە کە هەرکەس وەخۆ بگرێ، ڕەدی ناکاتەوە. هەتا زیندووی خۆ لەو بپارێزە کە بێنیازە. کاری خۆت بەو بسپێرە کە بێشەریکە. لە هەقتەعالا جگە لە خۆی هیچ مەخوازە کە زیان دەکەی. "

**۳۳٥. هەروەتر:**

کوتی " هەتا بەندە ئەو باوەڕەی هەبێ کە لە نێو خەڵک دا کەسێک لەو خرابتر هەیە، هێشتا خۆپێزۆرە. "

**٣٣٦. دەگێڕنەوە کە:**

کاتێک شێخ وەفاتی کرد ئەوەی لە پاشی بە جێ مابوو بەرماڵێک بوو و کڵاوێک و کەوڵێک و جووتێک پێڵاو و گۆچانێک و کاسەیەک و کراسێک. کە لێیانکۆڵیوە ئەو کراسە هی ئەبووموسا بوو.

--------------------

دە کتێبی اللمع فی التصوف دا نووسراوە:

کاتێک بایەزید مرد جگە لە جلێک چی بە جێ نەهێشت کە ئەویش بە ئامانەت وەرگیرابوو و پاشان دایانەوە بە خاوەنەکەی. (ل ٢٢٦)

**٣٣٧. دەگێڕنەوە کە:**

کاتێک شێخیان ناشت، ئوممی عەلی، خێزانی شێخ ئەحمەدی خەزروویە، هاتە زیارەتی مەرقەدی شێخ. کاتێک زیارەتی کرد کوتی " دەزانن **بایەزید** کێ بوو؟ "

کوتیان " تۆ باشتر دەزانی. "

کوتی " شەوێک لە تەوافی کەعبە تاوێک دانیشتم و خەوم لێکەوت خەونم بینی کە منیان بردە ئاسمان هەتا ژێر عەرش. لەوێ بیابانێکم بینی سەر و بن نادیار و هەموو ئەو بیابانە گوڵ و ڕەیحان، لە سەر هەر پەلکێک نووسرابوو کە: **ئەبوویەزید** ولی الله. "



## تفسیر کشف الاسرار

٣٣٨.

بوویەزیدی بەستامی کوتی:

لە خودام ویست هەتا ئیبلیسم پێبنوێنێ. ئەوم لە حەرەم دیتەوە و وە قسەم هێنا و ژیرانە دەدوا. پرسیم " ئەی بێچارە بەو ژیرییە بۆچ ئەمری هەقت بەجێ نەهێنا؟ "

کوتی " ئەی **بایەزید**! ئەو ئەمری ئیبتلا بوو نەک ئەمری ئیرادەت. ئەگەر ئەمری ئیرادەت با هەرگیز بێ ئەمرییم نەدەکرد. "

کوتم " ئەوە دژایەتی هەقە کە تووشی ئەو ڕۆژەی کردووی! "

کوتی " دژایەتی لە دژ بۆ دژە و خودا دژی نییە و هاوڕایی لە وێنە بۆ وێنەیە و خودا هاووێنەی نییە. " ئەوەی کوت و ون بوو.

٣٣٩.

ڕۆژگارێک داهات کە **بایەزید** کەمتر زیکری بە سەر زمان دا دەهات، کاتێک لێیانپرسی، کوتی " زۆرم پێ سەیرە ئەو یادەی زمان، لەوە سەیرتر کوا بێگانەیە؟ بێگانە چ دەکا لە نێوانمان، کە یادی ئەوە خۆی لە دەروونی گیان. "

٣٤٠.

کەسێک لە **بایەزیدی** پرسی " ئەو تیرەی هەق کە دڵی دەروێشانی نیشانە کردووە، چیە؟ "

**بایەزید** کوتی " ئەو پرسیارە هی تۆ نییە و تۆ ئەهلی ئەو پرسیارە نی! کە ئەمە پرسیاری حەزرەتیانە و من لای حەزرەت بووم و تۆم نەبینی. "

ئەو کەسە کوتی " زۆر لە غەڵەت دای ئەی **بایەزید**! من لە دەرگا بووم، عەیان منیان ڕێ دا، مێهر پەردەی هەڵگرت، واحیدییەتی منی لە پەنا خۆی جێ کردەوە، جا غەیرەت پەردەی داداوە و تۆ لە بەر دەرگا مایەوە! تۆ چ خەبەرت لە من هەیە؟ "

**بایەزید** پرسی " ئەمە نیشانەیەکی هەیە؟ "

کوتی " نیشانە ئەمەیە کە ئێستا بەرەو دەرگا دەچمەوە، ئەگەر کار و مەقامێکت هەیە بیهێنە هەتا یاریدەت بدەم. " ئەوەی کوت و گیانی دا.

**بایەزید** کوتی " ئاخ کە غەوسی جەهان بوو. "

٣٤١.

عارفێک بۆ **بایەزیدی** نووسی " ئەگەر کەسێک لە خودا غافڵ بێ و بە شەو بخەوێ، هیچ دەکرێ کە بە مەنزڵ بگا؟ "

**بایەزید** جوابی نووسیوە " ئەگەر شنەی لوتفی ئەزەلییەت لە هەوای فەردانییەت بە حوکمی عینایەت بشنێتە سەر دڵی، بێ هیچ زەحمەتێک دەگاتە مەنزڵ. "



٣٤٢.

**بایەزید** کوتی " چل ساڵە من دەگەڵ خەڵک قسەم نەکردووە، هەرچیم کوتووە بە هەقم کوتووە و هەرچیم بیستووە لە هەقم بیستووە. "

٣٤٣.

**بایەزید** کوتی " هەرکەس بۆ خۆی کارێک بکا، بۆ خودا کارێکی نەکردووە! و هەرکەس بۆ خودا کارێک بکا، بۆ خۆی کارێکی نەکردووە و خۆی نەبینیوە. "

٣٤٤.

حەدیسی دڵیان لە **بایەزیدی** بەستامی پرسی، کوتی " دڵ ئەوەیە کە بە قەرا یەک زەڕڕە ئارەزووی خەڵکی تێدانەبێ. "

٣٤٥.

**بایەزیدی** بەستامی کوتی:

دەروێشێکی لەبەر دڵێشیی و شێواوڕەنگیی و سەرلێشێواویی، وەک مسافرەکان هاتە لای و لە تاو وەجدی خۆی کوتی " ئەی **بایەزید** چ دەبوو ئەگەر ئەو خاکە بێباکە نەبا؟ "

**بایەزید** لە خۆ چوو و بە سەر دەروێش دا گوڕاندی کە " ئەگەر خاک نەبا، ئەو سۆزی سینەیە نەدەبوو! ئەگەر خاک نەبا شادیی و خەمی دین نەدەبوو! ئەگەر خاک نەبا، ئاگری ئەشقی هەڵنەدەکرد! ئەگەر خاک نەبا بۆنی مێهری ئەزەل بە کێ دەگەیشت؟ ئەگەر خاک نەبا کێ ئاشنای خودای لەم یەزەل دەبوو؟ ئەی دەروێش! لەعنەتی

ئیبلیس به هۆی کەماڵی جەلالی خاکە، ریزوان به هەموو غیلمان و وەلەدەکانیەوە، خاکی قەدیمی خاکە، بەختەوەریی ئەزەلیی توحفە و خەڵاتی خاکە، سفاتی ڕەببانی ڕازێنەریی جەماڵی خاکە، مەحەببەتی ئیلاهی خۆراکی ئەسراری خاکە، سفاتی قەدیم تێشووی ڕێگای خاکە، زاتی پاکی بێخەوش، مەشهوودی دڵەکانی خاکە "

.٣٤٦

**بایەزیدی** بەستامیی دەڵێ " ئەگەر ڕۆژی قیامەت به من بڵێن چ ئارەزوویەکت هەیە، دەڵێم ئارەزووی من ئەوەیە کە بچمە دۆزەخ و ئەو نەفسە پێشکەشی ئاگر بکەم کە دە دونیا دا گەلێک لەو تووشی گەوزان هاتم و ڕەنجی ویم چێژت. "

.٣٤٧

**بایەزید** بەستامیی کاتێک لە مەقامی تەوحیدی ئیقرار دابوو، مریدێک کوتی " ئەی شێخ خودا دەناسی؟ "

کوتی " لە هەموو عالەم دا کەسێک هەیە کە خودا نەناسیٚ؟ "

کاتێکی دیکە نوقمی دەریای تەوحیدی مەعرەفەت بوو، پێیانکوت " خودا دەناسی؟ "

کوتی " من کێم کە ئەو بناسم و ئایا لە هەموو عالەم دا کەسێک هەیە کە ئەو بناسیٚ؟ "



## ترجمە رسالە قشیریە

٣٤٨. هەروەتر دەگێڕنەوە کە:

بوویەزید دەگەڵ یارێک جلی دەشوشت لە سەحرا. ئەو یارە کوتی " جل بە دیوارەکان دابدەین. "

کوتی " ناکرێ بزمار لە دیواری خەڵک بدەین. "

کوتم " بە درەختەکانی دابکەین. "

کوتی " نا لقەکانیان دەشکیٚ. "

کوتم " کەوایە چ بکەین، بە سەر ئەو گیایانەی دابدەین. "

کوتی " نا، گیای حەیوانانە و لەوانی داناپۆشین. "

پشتی دە خۆرەتاو کرد و کراسی بە پشتی دادا هەتا ویشک بۆوە.

.٣٤٩

بە **ئەبوویەزیدیان** کوت " بەندەی خۆبەکەمزان کێیە؟ "

کوتی " ئەوە کە مەقامێک و مەجالێک بۆ خۆی نەبینیٚ و دە نێو خەڵک دا هیچکەس بە لە خۆی خرابتر دانەنیٚ. "

٣٥٠.

شێخ **ئەبوویەزید** لە پیاوێکی پرسی کە " پیشەت چیە؟ "
کوتی " کەردار و خەربەندەم "
کوتی " خودا مەرگ بدا بە کەرەکەت هەتا بەندەی خودا بی نەک بەندەی کەر. "

## نفحات الانس

٣٥١.

ئوستادی وی کوردێک بووە. وەسیەتی کرد کە قەبری من ژێرتر لە ئوستادەکەم بنێن و دابنێن بۆ خاتری حورمەتی ئوستاد.

٣٥٢.

**بایەزیدیان** دوای مەرگ دە خەو دا بینی کوتیان " حالّی تۆ چۆنە؟ "
کوتی " بە منیان کوت: ئەی پیر چت هێناوە؟ "
کوتم " دەروێشێک کە بچیتە دەرگای پادشا نالّێن چت هێناوە، دەلّێن چت دەویّ؟ "
وە کوتیان لە **نەیشابوور** پیرێژنێکی عێراقیی بوو بە ناوی **ئەزدەرها** کە سوالّی دەکرد، مرد. دە خەو دا بینیان کوتیان " حالّت چۆن؟ "
کوتی " بە منیان کوت چت هێناوە؟ "
کوتم " ئاخ! هەموو عومر منیان بەوە حەوالّە دەکرد کە خودا بتداتیّ! ئێستا دەلّێن چت هێناوە. "
کوتی " ڕاست دەکا لێیگەڕێن. "



## عوارف المعارف

٣٥٣.

**بایەزید** کوتوویەتی " هەرکەس کە شێخی نەبیّ، شێخی ئەو شەیتانە. "

٣٥٤.

سولّتانی عارفان **بایەزیدی بەستامیی** کوتی:
هیچکەس وەها منی نەبەزاند کە لاوێکی بەلخیی لە حەج هاتبۆوە، بە منی کوت " یا **بایەزید** حەددی زوهد لای تۆ چیە؟ "
من کوتم "ئەگەر وە گیرم بکەویّ دەخۆم و ئەگەر دەستم نەکەویّ سەبر دەگرم. "
کوتی " سەگەکانی **بەلخ** -یش هەر ئەو سفەتەیان هەیە. "
جا من بەوم کوت " حەددی زوهد لای ئێوە چیە؟ "
کوتی " ئێمە ئەگەر وە گیرمان نەکەوت سەبر دەگرین و ئەگەر دەستمان کەوت دەیبەخشین. "

--------------------

ئەو ڕەوایەتە دە تەزکەرەی ئەولیا دا بە ناوی شەقیقی بەلخی و ئیبراهیمی ئەدهەم هاتووە:

شەقیق چوو مەککە و لەوێ تووشی ئیبراهیمی ئەدهەم هات. شەقیق کوتی " ئەی ئیبراهیم! چ دەکەی لە کاری مەعاش دا؟ "

کوتی " ئەگەر شتێک بگا شوکر دەکەم و ئەگەر نەگا سەبر دەگرم."

شەقیق کوتی " سەگەکانی بەلخیش ئەمە دەکەن کە ئەگەر دەستیان بکەوێ موراعات دەکەن و کلکەسووتەی دەکەن و ئەگەر دەستیان نەکەوێ سەبر دەگرن. "

ئیبراهیم کوتی " ئەی ئێوە چ دەکەن؟ "

کوتی " ئەگەر شتێکمان پێبگا دەیبەخشین و ئەگەر نەگا سەبر دەگرین. "

ئیبراهیم هەستا و سەری ماچ کرد و کوتی " انت الستاذ والله. " (ل ٢٣٦)

.٣٥٥

لە سوڵتانی عارفان **بایەزیدی** بەستامییان پرسیار کرد " وەجهی بژیوی تۆ چلۆنە؟ "

کوتی " خودای من بژیوی سەگ و بەراز دەگەیەنێ، من مەحرووم ناهێڵێتەوە. "





.٣٥٦

حەزرەتی **سوڵتان وەلەد** فەرمووی کە:

ڕۆژێک باوکم لە مەدرەسە مەعانیی دەفەرموو، کوتی کە " مریدی ڕاستەقینە ئەوەیە کە شێخی خۆی سەرووتر لە گشت بزانێ. هەروەک کەسێک لە مریدی **ئەبایەزیدی** پرسیوە کە: شێخی تۆ گەورەترە یا **ئەبووحەنیفە**؟ کوتی: شێخی من! کوتی: **ئەبووبەکر** گەورەیە یا شێخی تۆ؟ کوتی: شێخی من! کوتی: خودای تەعالا گەورەیە یا شێخی تۆ؟ کوتی: من خودام دە شێخ دا دیوە و جگە لە شێخ من شتێکی دیکە ناناسم.

هەروەتر لە یەکێکیان پرسی کە: خودای تەعالا گەورەیە یا شێخی تۆ؟ کوتی: دە نێو ئەو دوانە دا هیچ فەرقێک نییە.

عارفێکی دیکە کوتوویەتی کە: لەو دوو گەورەیە، گەورەترێک پێویستە هاتا بتوانێ فەرقێک دابنێ. "

.۳۵۷

هەروەتر فەرمووی کە:

دوو یاری هاودڵ چوونە خزمەت قوتبی عارفین **ئەبایەزیدی بەستامیی** و بوون بە میوانی. شێخ فەرمووی کە " لە کەیەوە بوونە یاری یەکتر؟ "

کوتیان " سی ساڵە هاودەمی یەکترین و خەریکی سیاحەتی بەرڕ و بەحرین. "

فەرمووی کە " بەحوکمی عادەت هیچ کێشە و شەڕێکتان دەگەڵ یەکتر بووە؟ "

کوتیان " نا! "

فەرمووی کە " سی ساڵە بە مونافقیی دەگەڵ یەک جووڵاونەوە؛ چونکە مرافەقەت و موافەقەتی ئێوە لە سەر مونافەقەت بووە، چونکە غایەتی یاریی و مەزەی خۆشەویستیی دەوە دایە کە دە نێوانتان دا ئاشتی و شەڕ و کێشەیەک پێکبێ و سەرلەنوێ ئاشت بنەوە هەتا عیللەتی مونافەقایەتیی ڕێ نەباتە نێو دڵتان و لە شەڕڕی نفاق ئەیمەن بن. "

.۳۵۸

دەروێشێک هاتە خزمەت **ئەبایەزید** هەتا ببێتە مرید.

شێخ فەرمووی کە " لەو گوناهە گەورانەی نێوان ژنان و پیاوان کە باس دەکرێ، هیچیانت کردووە؟ "

کوتی " نا! "

فەرمووی کە " برۆ هەموویان ببینە و لێیانتێپەڕە و ئەوسا وەرەوە و ببە مرید هەتا مەبادا لە خەلوەت دا ببنە ڕێگری زوهدی تۆ و کارەساتێک دە دەروونی تۆ دا بقەومێ. "



# مقالات شمس تبریزی

.۳۵۹

**ئەبایەزید** دەگەیشتە هەر شارێک، ئەگەر ئارەزووی سەیرانی هەبا دەچوو گۆڕستانی ئەو شارە... **ئەبایەزید** لە گۆڕستان دەگەڕا کەللەسەری بەشەری دیتەوە. ئیلهام هاتە دەروونی کە " هەڵیگرەوە و تێیبڕوانە جوان جوان. "

گوێی هەندێک لە کەللەکانی بەستراو بینی، بێ کون. گوێی هەندێکیانی کون بینی هەتا گوێیەکەی دیکە، لەو گوێیەوە هەتا گوێی دیکە. گوێی هەندێکیانی کون بینی هەتا ئەوک.

کوتی " خودایا، خەڵک هەموو ئەوانە وەک یەک دەبینن و بە من تەفاوەتت نواند، ئیستا هەر بۆ خۆشت حەلی بکە کە بۆچی ئەو کەللەیانە بەو جۆرەن؟"

ئیلهام هات کە " ئەو کەللەیانەی کە هیچ دە گوێیان دا هیچ کونێک نەبوو کەلامی ئێمە هیچ نابیسن. ئەوانەی کە کونیان لەم گوێیەوە هەتا گوێی دیکە بوو، لەم گوێیە دەیانبیست و لە گوێی دیکە دەریان دەکرد. ئەوانەی کە لە گوێ هەتا ئەوک کون بوو قەبووڵیان دەکرد. "

٣٦٠.

**ئەبوویەزید** پیادە دەچوو حەج، حەفتا حەجی کردبوو. ڕۆژێک دیتی کە خەڵک لە ڕێگەی حەج بۆ ئاو موحتاج و هیلاک بوون. سەگێکی دیت نزیک ئەو چاڵاوەی کە حاجیەکان لە سەری دەورەیان دابوو و خۆیان لێدەپاراست. ئەو سەگە چاوی لە **ئەبوویەزید** دەکرد. ئیلهام هات کە " بۆ ئەم سەگە ئاو دەست بخە! "

جاڕدەر هەرای کرد " کێ حەجێکی مەبرووری مەقبوول دەکڕێتەوە بە شەربەتێک ئاو! "

هیچکەس ئیلتفاتی پێنەکرد. لێیان زیاد دەکرد پێنج حەجی پیادەی مەقبوول و شەش و حەوت هەتا گەیشتە حەفتا حەج.

یەکێک هەرای کرد کە " من دەیدەم. "

بە خاتری **ئەبوویەزید** دا هات کە " حەیف کە بۆ خاتری سەگێک حەفتا حەجی پیادەم بە شەربەتێک ئاو فرۆشت. "

کاتێک ئاوی دە تەغار کرد و لە پێش سەگی نا، سەگ ڕووی وەرگێڕا. **ئەبوویەزید** بە ڕوو دا کەوت و تۆبەی کرد.

نەدا هات کە " چەندە بە خۆت دەڵێی ئەمەم کرد و ئەوەم کرد بۆ هەق! بڕوانە کە سەگێکیش قەبووڵی ناکا. "

هاواری کرد کە " تۆبەم کرد، ئیدی وا بیر ناکەمەوە. " دەستبەجێ سەگ دەمی دە ئاو نا و خواردیەوە.

٣٦١.

**ئەبوویەزید** کە دەچوو حەج، بە تەنیا چوونی پێخۆش بوو، نەیدەویست دەگەڵ کەس ببێتە یار. ڕۆژێک کەسێکی بینی کە لە پێشەوەی ئەو دەڕۆیشت. سەیری کرد و لە سووک ڕۆیشتنی ئەو،



زەوقێکی تێکەوت. لای خۆی دوودڵ بوو کە ئاخۆ ببمە هاوڕێی؟ شێوەی تەنیاڕەویی بەردەم کە هاوڕێیەکی گەلێک خۆشە. دیسان دەیکوت کە: الرفیق الاعلی، دەگەڵ هەق دەبمە ڕەفیق تەنیا. دیسان دەیبینی کە زەوقی هاوڕێیەتی ئەوکەسە خۆشترە لە زەوقی ڕۆیشتن بە تەنیا، لەو باسە دا مابۆوە کە " کام هەڵبژێرم؟ " ئەو کەسە ئاوڕی داوە و کوتی " لە پێشدا تەهقیق بکە کە من قەبووڵت دەکەم بە هاوڕێیەتی؟ "

ئەو سەری سوڕما... ئەوکەسە هەنگاوی خێراتر کرد.

٣٦٢.

**ئەبایەزید** نەفسی خۆی قەڵەو بینی، کوتی " بە چی قەڵەو بووی؟ "

کوتی " بە شتێک کە نەتوانی چارەی بکەی و ئەو ئەوەیە کە خەڵک دێنە لات و دادێنەوە و تۆ خۆت بە موستەهەقی ئەو داهاتنەوەیە دەبینی. "

کوتی " تۆ غالبی ئاقیبەت، من ناتوانم بە سەرت دا زاڵ بم. " وەختی مەرگ، داوای زونناری کرد.

# نورالعلوم

.٣٦٣

**ئەبوویەزید** کوتی " دوورترین لە دەرگای خوداوەند، کەسانێکم بینی کە ئەوان خۆیان پێ نزیکترە. "

.٣٦٤

**ئەبوویەزید** کوتی کە " جوابی قسەتان لە بیر بێ، هەرکەس جوابی قسەی [پاشەڕۆژی] خۆی لە بیر نەبێ، لە هەرکوێیەک قسە بکا باکی نابێ؛ حیسابی رۆژی قیامەتان لە بیر بێ چونکە هەرکەس حیسابی قیامەتی لە بیر نەبێ، ماڵ لە هەرکوێ دەست بخا باکی نابێ؛ قەدری چوونیش باش بزانن، هەرکەس قەدری چوون باش نەزانێ قسە دەگەڵ هەرکەس کە بکا باکی نابێ. "

--------------------

دە کتێبی نوشتە بر دریا دا وەها هاتووە:

دەگێڕنەوە کە شێخ ئەبولحەسەن[ی خەرەقانی] کوتی " بایەزید کوتوویەتی: جوابی قسەتان لە بیر بێ، هەرکەس جوابی قسەی لە بیر نەبێ هەرجۆرێک قسە بکا باکی نییە و حیسابی قیامەتتان لە بیر بێ چونکە هەرکەس حیسابی رۆژی قیامەتی لە بیر نەبێ ماڵ لە هەرکوێوە کۆ بکاتەوە، باکی نابێ. " (ل ٤٢٤)



.٣٦٥

لای **ئەبوویەزید** کوتیان کە " شەو بوو کە حاتەم[ی ئەسەم] لە خەڵک هەڵبڕا. "
کوتی " ئەگەر هەڵبڕا بیکەن بە پیاوێکی نموونە دە نێو خەڵک دا هەتا بە شوێن ئەو دا پیاوەکان رابن. "

.٣٦٦

**بوویەزید** کوتی "ئیلاهی! لەو دۆستایەتییەی من زەوی ئاگادار بکە."
زەوی جمی.
پیاوێک کوتی " یا شێخ زەوی دەجمێ. "
کوتی " ئادی، خەبەریان پێداوە. "

.٣٦٧

بە **بوویەزی**دیان کوت " بە هەوڵی بەندە هیچ پێکدێ؟ "
کوتی " نا، بەڵام بێ هەوڵیش نابێ. "

.٣٦٨

**بوویەزید** جارێک وە ماڵ کەوت تەبەکێکی هەرمێ بینی، کوتی " کێ هێناویەتی؟ "
کوتیان " فلانی. "
کوتی " هەڵیگرن و بیبەنەوە و بڵێن: ئاوی خەڵک وەردەگری و درەختەکان ئاو دەدەی و هەرمێ بۆ من دەنێری؟ "

.٣٦٩

**بیلالی بەلخیی** بە **بوویەزیدی** کوت " من ئەوساڵ تۆم لە مەککە بینی. "
**بوویەزید** کوتی " من ئەو نەبووم. "

سێ جار **بیلال** وای کوت.
خەڵک کوتیان " ئێمە **بیلال**مان پێ درۆزن نییە و تۆش، ئەوە چ حاڵێکە؟ "
کوتی " موئمین لە تەبەقی هەتاو عەزیزترە بۆ خودا. تەبەقی هەتاو لە یەک جێگەیە بەڵام لە هەموو شارەکانەوە دیارە، خۆی دەیهێنێ و خۆی دەیبا، ئەو نواندنە لە خوداوەیە وەها کە بەندە ئاگای لێنییە. "

٣٧٠.

**بوویەزید** کوتی " **ئیبراهیم** لای خوداوەند گەیی لە سارە کرد، فەرمان هات: دەگەڵ **سارە** بسازێ هەتا بتوانی بژی. و نەیفەرموو کە: **سارەی** بەرڵڵا بکە. "

٣٧١.

**ئەبوویەزید** جارێک کوتی " قیامەت من بکە سپەرێک دە نێوان حوکمی تۆ و خەڵکی تۆ، حیسابی وان دەگەڵ من بکە، کە ئەوان زەعیفن، بەرگە ناگرن. "

٣٧٢.

**بوویەزید** کوتوویەتی " بەندەی باش ئەو کەسەیە کە هەردووک دەستی وی راست بێ. " یانی ئەوەی کە بە هەردووک دەستی دەیکا چاکە بێ هەتا فریشتەکانی دەستی راست بینووسن، شتێک نەبێ کە فریشتەکانی دەستی چەپ بینووسن.

٣٧٣.

بوویەزید کوتی " ئەی قورئانخوێنی ڕیایی، گریمان کە هەموو شتت بە عیلم راست کردەوە، چ لە ئیرادەتی دڵ دەکەی کە هەتا دەگەڵ خودا راست نەوەستی، سوودێکی نابێ. "



٣٧٤.

یەکێک هاتە لای بوویەزید و تەسبێحێک بە دەستەوە، کوتی " بیکە بە دوو! بە یەکیان چاکەی بژمێرە و بە یەکیان خراپە. "

## اللمع فی التصوف

٣٧٥.

لە بایەزیدی بەستامیم بیست کە: رۆژێک سفەتی عارفیان پرسی.
کوتی: ڕەنگی ئاو، ڕەنگی ئامانەکانە. ئەگەر دە دەفرێکی سپی بکەی ئاو بە سپی دەبینی و ئەگەر دە دەفرێکی ڕەشی بکەی، ڕەشی دەبینی. هەروەتر زەرد و سووریش هەر ئەمجۆرەن و ئەحواڵی عارف دەگەڵ ئەحواڵی سەروەری خۆی وەهایە.

٣٧٦.

بایەزید کوتوویەتی " هەرکەس بەهرە لە خامۆشیی وێژەر وەرنەگرێ، لە قسەکانی ویش چ تێناگا. "

٣٧٧.

لە یەحیا ئیبنی مەعازی رازیی دەگێڕنەوە کە سەرەتا پەشمینە و شڕەی دەپۆشی و لا ئاخر خەز و حەریر. ئەم قسەیان بە بایەزید

کوت، کوتی "بێچارە یەحیا! سەبری لە سەر سەختیی و کەمبایی نەگرت چلۆن دەتوانێ سەبر لە سەر نێعمەت و راحەتیی بگرێ. "

۳۷۸.

بایەزید کوتوویەتی " ئەوانەی کە پتر ئیشاڕە بە خودا دەکەن، پتر لە خەڵکی دیکە لە خودا دوورن. "

۳۷۹.

بایەزید کوتی " هەرکەس بە عیلم ئیشاڕە بە خودا بکا کافر بووە چونکە کاتێک بە عیلم ئیشاڕە بە شتێک دەکەین، مەعلووم دەناسین و هەرکەس بە مەعرەفەت ئیشاڕە بەو بکا مولحید بووە چونکە ئیشاڕە بە مەعرەفەت وەختایەکە کە ناسراو حەددی هەبێ. "

۳۸۰.

بایەزید کوتی " لای عالیمێک پەسنی یەک لە موریدانم کرد. عالیم کوتی: مەعاشی ئەو لە کوێوە دێ؟ کوتم: شک لە خولقێنەری ناکەم هەتا لە رسقدەری پرسیار بکەم. عالیم خەجاڵەت بۆوە و بێدەنگ بوو.

۳۸۱.

بایەزید کوتی " ئەگەر کەسێک بەڕماڵی لە سەر ئاو رابخا و لە سەر هەوا چوارمەشقی دابنیشێ، فریوی مەخۆن هەتا ئەوتان بە حەڵاڵ و حەرام بە تاقی نەکردۆتەوە. "



## نوشته بر دریا

۳۸۲.

**بایەزید** بە مریدانی کوت کە " خوداوەند دەڵێ: هەرکەس منی بوێ گەلێک کەرامەتی دەگەڵ دەکەم و هەرکەس تۆی بوێ کە بایەزیدی دەیفەوتێنم وەها کە لە هیچکوێ یادی ناکەم؛ ئێستا ئێوە دەڵێن چی؟ "

کوتیان " ئەگەر بمانفەوتێنێ ئێمە تۆمان دەوێ. " ل ۱۸٤

۳۸۳.

[خەرەقانی] کوتی:

رۆژی هەینی دەمەوە ئێوار دەرگای ئاسمان دەکەنەوە و مەلایکە لە مزگەوتی بایەزید دادەنیشن و دەرگای بەهەشت دەکەنەوە و حۆریەکان لە مزگەوتی بایەزید دادەنیشن و گۆڕی وی تەواف دەکەن و کاتی وا هەیە کە ماڵی کەعبە دێتە زیارەتی مزگەوتی بایەزید.

# شرح شطحيات

٣٨٤.

دەڵێن کە **ئەبوویەزید** کوتی " حەوت کەڕەت تەوافی **کەعبە**م کرد، جا کوتم: ئیلاهی! هەر حیجابێک کە دە نێوان من و تۆ دا بوو هەڵتگرت. لە سەرەوەی کەعبە نەدایان کرد کە: ئەی **بایەزید**! دە نێوان دۆست و دۆست دا حیجاب نییە. "

٣٨٥.

**ئەبوومووسا** دەڵێ کە:

**ئەبوویەزید** لە بانگەدەر الله اکبر-ی بیست، کوتی " من گەورەترم. "

# کشف المحجوب

٣٨٦.

لە بوویەزیدیان پرسی کە " ئەمیر کێیە؟ "

کوتی " ئەوکەسە کە ئیختیاری نەمابێ و ئیختیاری هەق لەو بووبێتە ئیختیار. "



ئەو چەند نوسخەی مێعراجی بایەزید کە لە بەر دەستمن هیچیان وەک یەک ناچن. ئەسڵی مێعراجی بایەزید هەرچێک بووە جێگەی دەست تێوەردان بووە و ئەو کەسانەی کە نووسیویانەتەوە بە پێی زەوق و ڕوانگەی خۆیان لێیان کەم و زیاد کردووە. منیش یا دەبا هەمووم وەرگێڕابانەوە کە سوودێکم تێدا نەبینی و یا دەبا دەستم لێهەگرتبا یا یەک دانەم هەڵبژاردبا. ئاکام بە پێی سەلیقەی خۆم ئەو وەرگێراوەم لێدەرکێشان کە دەتوانێ هەو بێ یا هەو نەبێ.

# مێعراجی شێخ بایەزید

بە چاوی یەقین ڕوانیمە هەق
پاش ئەوەی کە منی لە هەموو بوونەوەران بێنیاز کرد
منی بە نووری خۆی نوورانیی کرد
عەجایب و ئەسرارم لێ ئاشکرا بوون و خۆی بە من نواند
من لە هەقەوە ڕوانیمە خۆم و سفاتی خۆ
نووری من لە ئاست نووری هەق تاریکیی بوو
عەزەمەتی من لە ئاست عەزەمەتی هەق، عەینی حەقارەت بوو
عیززەتی من لە ئاست عیززەتی هەق ون بوو
لەوێ گشت سەفا بوو و لێرە گشت دژایەتیی
کە دیسان ڕوانیمەوە
بوونی خۆم دە نووری ئەو دا بینی
عیززەتی خۆم دە عیززەت و عەزەمەتی ئەو دا زانی
هەرچیم کردبا بە قودرەتی ئەو دەمتوانی بیکەم
بە چاوی ئینساف و هەقیقەت چاوم لێکرد
هەموو پەرستن لە هەقەوە بوو نەک لە من
من پێموابوو کە ئەوە منم کە ئەو دەپەرستم.
کوتم: خودایە! ئەمە چیە؟



کوتی: هەموو منم و نە غەیری من و نییە خودایەک جگە لە من.
کاتێک بە چاوی هەق ڕوانیمە هەق
هەقم بە هەق بینی
ماوەیەک دەگەڵ هەق، وەک هەق مامەوە
بێ نەفەس و بێ زمان و بێ گوێ و بێ زانایی
هەتا هەق بۆ منی خوڵقاند:
عیلمێک لە عیلمی خۆی
زمانێک لە لوتفی خۆی
چاوێک لە نووری خۆی.
هەموو بوونەوەرانم بە هەق بینی
چاوم لەو کرد بە نووری ئەو
بە عیلمی وی زانا بووم
بە زمانی لوتفی وی گۆیا بووم
کوتم: حاڵی من دەگەڵ تۆ چۆنە؟
کوتی: من هی تۆم بۆ تۆ، نییە خودایەک جگە لە تۆ
کوتم: خودایە بەوە بایی نابم
من بێ تۆ، لە خۆم بێنیاز نابم
تۆ بێ من هی من بی
باشترە لەوە کە من بێ تۆ خۆم بم
کاتێک بۆ تۆ لە تۆ بدوێم
باشترە کە بێ تۆ بۆ نەفسی خۆم بدوێم

کاتێک سەفای سیڕڕی منی بینی
دڵم نەدای ڕەزای هەقی بیست

له زوڵمەتی نەفس و له دژایەتی بەشەرییەتی تێپەڕاندم
زانیم که بەو زیندووم
له فەزلی ئەو بەساتی شادییم خسته دڵمەوه
کوتی: هەرچی دەخوازی، بخوازه!
کوتم: تۆم دەوێ که له فەزل فازلتری و له کەرەم گەورەتر
له تۆ به تۆ قانعم و ده تۆ دا به نەهایەت گەیشتووم
جگه له خۆتم پێمەنوێنه
به شتێکی جگه له خۆت، له خۆتم دوور مەکەوه.

ماوەیەک جوابی نەدامەوه.
پاشان کوتی: هەقه ئەوەی کوتت
هەقه ئەوەی بیستت
هەقه ئەوەی که دیتت
هەقه ئەوەی لێیگەڕای!
کوتم: ئەگەر دیتم به تۆم دیت
ئەگەر بیستم به تۆم بیست
کاتێک بەرەو هەق چووم و دەگەڵ هەق وەستام به هەق
دوو باڵی له عیزز و کیبریا دا به من
بەو دوو باڵه فڕیم و نەگەیشتمه عیزز و کیبریای وی
کاتێک بێهێزیی منی بینی و نیازی منی زانی
منی به هێزی خۆی بەهێز کرد
منی ڕازاندەوه و تاجی کەرامەتی نایه سەرم
دەرگای سەرای تەوحیدی له سەر من کردەوه
کاتێک زانی که سفاتی من گەیشتۆته سفاتی وی



له حەزرەتی خۆیەوه ناوێکی لێنام و بۆ خۆیی خۆی ڕێی دام
یەکیی پێکهات و دوویی ڕابوو
کوتی:
ڕەزای ئێمه ئەوەیه که ڕەزای تۆیه
ڕەزای تۆ ئەوەیه که ڕەزای ئێمەیه
سەری خۆت به تاجی کەرامەتی من بەرز بکەوه
به عیززەتی من خۆت عەزیز بکه
به سفاتی منەوه برۆ لای خەڵک
کەسایەتی من به کەسایەتی خۆت بەوان بنوێنه
هەرکەس تۆی بینی منی بینیوه
هەرکەس تەمای تۆی کرد، تەمای منی کردووه
ئەی ڕووناکی من له سەر زەوی من
ئەی ڕازاوەیی من له ئاسمانی من
کوتم: تۆ عەیانی منی ده عەینی من دا
زانایی منی ده نەزانیی من دا
تۆ نووری خۆت به هەتا تۆ به تۆوه ببینن
جگه له تۆ خودایەک نییه!
تۆ عالێمی و تۆ مەعلووم
تۆ تاکی و تۆ تاکانه
من له خۆتەوه به غەیر خەریک مەکه
من نامەوێ ئەوان ببینم
ئەگەر دەتەوێ من بۆ لای خەڵک بنێری، من دژایەتی تۆ ناکەم
من به وەحدانییەتی خۆت بڕازێنەوه
هەتا خەڵکی تۆ کاتێک من ببینن

له تۆیان ڕوانیبێ و من ده ئارا دا نەبم.

ئەو مرادەی دا بە من
تاجی کەرامەتی نایە سەرم
لە مەقامی بەشەرییەت تێیپەڕاندم
کوتی: بڕۆ لای خەلکی من!
یەک هەنگاو لە حەزرەت دوور کەوتم
هەنگاوی دووهەم لە پێ کەوتم
نەدایەکم بیست کە:
دۆستی من بێننەوە کە ئەو بێ من ناتوانێ بێ
جگە لە من ڕێگایەک نازانێ!

جا دەگەڵ وی بووم
گەلێک ساڵ لەو هەرێمە بە پێی فام ڕامکرد
هەتا بووم بە مەلێک
لەش لە یەکیی و باڵ لە هەمیشەیی
لە هەوای چلۆنایەتی دەفڕێم
کاتێک لە خولقاوان غایب بووم
سەرم لە هەرێمی ڕەببایەتی دەرکێشا
کاسەیەکم خواردەوە کە هەرگیز هەتا ئەبەد
لە تینوایەتی یادی ئەو تێراو نەبووم.
پاشان سی هەزار ساڵ لە فەزای وەحدانییەتی وی دا فڕیم
سی هەزار ساڵی دیکە لە خودایی دا فڕیم
سی هەزار ساڵی دیکە لە تاکانەیی دا فڕیم.



کاتێک نەوەد هەزار ساڵ تەواو بوو
جا چوارهەزار بیابانم بڕی
گەیشتمە نەهایەت.
ئەوسا بە چاوی زات ڕوانیە من
منی بە ناوی خۆی بانگ کرد
کوتی: ئەی من!
کوتم: ئەی تۆ!
کوتی: ئەی تۆ!
کوتم: ئەی من!
جا بە منی کوت: تۆ تاکانەی
کوتم: منم تاکانە
بە منی کوت: تۆی تۆ
کوتم: منم من!
جا بایەزیدم بینی و من هەرچیم بینی
هەموو من بوو.

# سەرچاوەکان


اسرار التوحید فی مقامات الشیخ ابی سعید، شفیعی کدکنی، انتشارات آگاه، چاپ دوم، ۱۳٦۷

اللمع فی التصوف، ابونصر سراج طوسی، رینولد آلن نیکلسون، ترجمه دکتر مهدی محبتی، چاپی دوم، ۱۳۸۸

ترجمه رساله قشیریه، بدیع الزمان فروزانفر، مرکز انتشارات علمی و فرهنگی، ۱۳٦۱

تذکرة الاولیا، فریدالدین عطار نیشابوری، دکتر محمد استعلامی، چاپی هشتم، ۱۳۷٤

تذکرة الاولیا، عطار نیشابوری، ا. توکلی، چاپ هفتم ۱۳۸۷

تفسیر کشف الاسرار، خواجه عبدالله انصاری، حبیب الله آموزگار، چاپی یازدهم، ۱۳۷٦

تلبیس ابلیس، ابوالفرج ابن جوزی، علیرضا ذکاوتی قراگزلو، نشر دانشگاهی، چاپ دوم، ۱۳۸۱

دفتری روشنایی، محمد رضا شفیعی کدکنی، ، چاپ سوم، ۱۳۸۵

شرح شطحیات، روزبهان بقلی شیرازی، هانری کربین، کتابخانەی طهوری، ۱۳٦۰





فیهی ما فیهی، مەولەوی، و: عەلی نانەوازادە، موکریانی، هەولێر، ۲۰۰٦

عوارف المعارف، شهاب الدین سهروردی، قاسم انصاری، انتشارات علمی و فرهنگی، ۱۳٦٤

کشف المحجوب، هجویری، تصحیح دکتر محمەد عابدی، چاپ دوم، ۱۳۸٤

مقالات شمس تبریزی، محمد علی موحد، انتشارات وزارت فرهنگ و ارشاد اسلامی، چاپ دوم، ۱۳۷۷

مناقب العارفین، شمس الدین محمد افلاکی، تحسین یازیجی، چاپ چهارم، ۱۳۸۵

نفحات الانس، عبدالرحمن بن احمد جامی، مهدی توحیدی پور، انتشارات محمودی، تهران ۱۳۳۷

نورالعلوم، بکوشش عبدالرفیع حقیقت، انتشارات کتابخانه بهجت، چاپ سوم، ۱۳٦۹

نوشته بر دریا، محمد رضا شفیعی کدکنی، ، چاپ سوم، ۱۳۸٤